# پەشار کەمال

# دار هەناری سەر گردەکە

وەرگێڕانی: خالید فاتیحی






ڕۆمان





.ەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
ـشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
ـەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


- **دارهەناری سەرگردەکە**
- نووسینی: یەشار کەمال
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: خالید فاتیحی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠١١
- تیراژ: ١٠٠٠دانە
- چاپخانە: وەزارەتی رۆشەنبیری و لاوان
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٧٢٨)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.

زنجیرەی کتێب (٦١٩)

ـر کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
ـشنبیری لەسەر ئەم ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.con

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## بەرایی:

دارهەناری سەرگردەکە، دوا کورتە ڕۆمانمە، کە پێش هاتنم بۆ ئەستەمبوڵ لە(قەدیرلی) نووسیبووم و لێم ون ببوو، لە قەدیرلی لەناو باولی دایکمدا دیتبوویانەوە. ساڵی ١٩٦٦ئامۆزایەکم لەگەڵ خۆی بۆی هێنامەوە. مێژووی تەواوکردنی ڕۆمانەکەم یاداشت کردبوو، چوارشەممە ١٩٥١/١/٣١ پێنج لاپەڕەی کۆتاییەکەی لێکرابۆوە، دووبارە پێنج لاپەڕەکەم نووسییەوە، تەقریبەن بێ ئەوەی هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردابێنم چاپی دەکەم.

ئەگەر ئەمڕۆ ویستبام، دارهەنارەکە بنووسم بەجۆرێکی تر دەمنووسی. بەڵام بە تەڕ و پاراوی و ناسکییەکەی نەدەگەیشتم.

لە ساڵانی ١٩٤٩-١٩٥٠ تراکتۆر گەیشتە چوکوراوا، ئەو جوتیارانەی لە کێڵگەی ئاغاکاندا کاریان دەکرد و نیوەی بەروبوومەکەیان دەست دەکەوت، لەسەرکار دەرکران و بۆ ئەو کرێکارانەش کە لە کوێستانەکانڕا دەهاتن هیچ کارێك نەمابووەوە و نەشیان دەتوانی خۆیان لەبەر ئەو لەرزوتاو نۆبەتییە ڕابگرن و دەمردن.

من لە دار هەناری سەرگردەکەدا هەوڵم داوە پەیوەندیی نێوان هێرشی تراکتۆر و بێکاری لەرادەبەدەر نیشان بدەم. یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانی من، کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و سروشتم تێدا وێنە کێشابێ، ئەم ڕۆمانەیە.

یەشار کەمال

ژنەکەی (حەمەد) لەناوەڕاستی دەشتە کاکی بە کاکییەکەدا، ڕەق ڕامابوو. داهاتەوەو ەوییەکەی هەڵکۆڵی. پاش ماوەیەکی زۆر چەند دانە تۆوێکی دیتنەوە. دەنکەکانی بە قامکان ێکگوشین و پاشان بەددانی تاقی کردنەوە و لە گیرفانی هاویشتن.

لەبەرخۆیەوە گوتی: ( وەی! قورم وەسەری بوو، هەموو ڕزیون، وەی ماڵمان خرابوو. )

دووبارە زەوییەکەی هەڵکۆڵییەوە، چەند دەنکێکی دیکەشی دۆزییەوە، دووبارە بەددان اقی کردنەوە، پاشان بە ڕقەوە تفی کرد و گوتی: پەکو، چەندەم کوێرەوەری پێوە دیت.

لەکێڵگەکەدا بچووکترین سەوزایی نەدەبینرا، سەرتاسەری ئەو زەوییە خاکێکی خۆڵەمێشی و، هیچ شتێکی زیندووی تێدا بەدی نەدەکرا.

گوتی : ( دەمرین. ئەو ساڵ دەمرین... وەی چ بەلآیەکمان بەسەرهات. )

پاشان دانیشت و دۆش داما. تەماشای دەشتە کاکی بەکاکییەکەی کرد. سەری لەگێژەوە ەهات. جارجار دەیگوت:

( وەی وەی چ کوێرەوەرییەکمان پێوەدیت... . )

تا لای نێوارێ لەو جێگایەی لێی دانیشتبوو، نەبزووت. حاڵەتێکی سەیری هەبوو، تگوت لەگیانەلآ دایە. پاشان هاتەوە سەرخۆو وەڕێکەوت. سێبەر شۆڕ ببوونەوە کە یشتەوە ماڵێ. بە نێوچاوان گرژیی و تووڕەییەوە لە پەنا ئاگردانەکە دانیشت.

حەمەد گوتی:

- کچێ ئێمە بەیانی دەڕۆین. هەر کە گەیشتمە چوکوراوا، بەپۆستدا پارەت بۆ دەنێرمەوە. تۆ دوای دە ڕۆژان بچۆ لای جەمال ئەفەندی دووکاندار، پارەکە لە ڕێگای ئەو دەنێرمەوە.

ژنە ولآمی نەدایەوە. حەمەد گوتی:

- چ بووە کچێ؟

ژنە لەناکاو هەموو قەهر و تووڕەیی خۆی بەسەر ئەودا ڕشت و گوتی:

- برۆ. برۆ چوکوراوا. تەواوی تۆوەکان ڕزیون. باشە لەو دە ڕۆژە دا چی بخۆین؟ خوێش اوبووە. لە ئاردی هەر گەڕێ، خوێش تەواوبوو. لەو دە ڕۆژەدا چی بخۆین؟ تەواوی تۆوەکان بون...

لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دوو کاریلە یارییان دەکرد. چوار منداڵ بە کراسە شڕەکانیانەوە، لە گۆشەیەك وەستابوون. تەنیا منداڵە بچووکەکەیان کە کراسەکەی لە بەریەك هەڵوەشابوو، لەشی خستبووە دەرەوەو چڵمە شۆڕەوەبووەکەی هەڵدەلووشی.

حەمەدگوتی:

- ئافرەت بزنەکووڕێ دەفرۆشین. تەنەکە گەنمێکی پێ دەکڕین، بەباقی پارەکەش خوێی پێ دەکڕین.

ژنەگوتی:

- بیفرۆشە، ئەوتاقە بزنەش بفرۆشە، ئەوەندە دۆیەشمان ببڕە.

حەمەد:

- کاتێك لەچوکوراوا گەڕامەوە، لەجیاتیان دوو بزنان دەکڕم. چوارانت بۆ دەکڕم.

ژنە گوتی:

- بیفرۆشە، بیفرۆشە با لە کەوڵ و پێستیش بین !

حەمەد توڕە بوو گوتی:

- دەیفرۆشم، زۆر باشیش دەیفرۆشم.

ژنە:

- بیفرۆشە، بیفرۆشە بامرین.

بۆ سبەینێ حەمەد بزنەکەی بە(دۆران ئەفەندی) فرۆشت، کە خەڵکی گوندێکی دیکە بوو. دەتگوت لەو ماڵەدا کەسێك مردووە. ژنە بۆ بزنەکووڕێ زووڕ زووڕ دەگریا. حەمەد نەڕۆیشتەوە ماڵێ. نەیدەتوانی تەماشای ژنەکەی بکات. هەر بۆیە لەدەرێ دەهات و دەچوو.

شنەبایەك کشپلی بزنەکەی بۆ بن دیواری ڕادەدا. لەدووریڕا سەروکەللەی حەمەدی دەرکەوت، دوایی (هۆسۆك) یش هات. لەقونەبانی خانوویەك دانیشتن وکەوتنەباسی چوکوراوا. قەراربوو تاریك و ڕوونی بەیانی وەڕێکەون.

هۆسۆك گوتی:

- درۆ دەکەن؟ چما دەکرێ لەو چوکوراوا گەورەیەی. . . !

حەمەد بە تووڕەییەوە گوتی:

- درۆیە درۆ. لەچوکوراوا کار دەست نەکەویٚ؟ هەمیشە بە دوای پیاواندا دەگەڕێن. درۆیە. . . هەر ئەوەندە بەسە لاقت بگاتە چوکوراوا.. . ئێستا لە چوکوراوا لە بەر کرێکاران دەپارێنەوە.

پاش کەمێك (وسوو)ش پەیدا بوو. هەردووك پێکەوە گوتیان:

- ئەوە هات.

- تێ کوڕینە.. . بیستم کە.. . بیستم کە دەچنە چوکوراوا، بیستم کە.. .

هۆسۆك گوتی:

- بە تەماین بچین. ئەمن و حەمەد و ئاشق عەلیشمان لەگەڵە.

وسوو گوتی:

- کوڕە بابە لەکەللەی داون. ئێوە دەتانەویٚ بەپێ مەرگەوە بچن. بەپێ نەخۆشی و نۆبەتیٚ. ئەقڵتان بۆ کویٚ چووە؟ چوکوراوا گاڵتە نییە. لەمن بپرسن تاپێتان بڵێم چوکوراوا یانی چی؟ دەردوبەلای چوکوراوا لە من بپرسن. من چوکوراوای دەناسم شێتینە. لەبرسان بمرن، بەلام مەچوونە چوکوراوا. شێتینە!حەیف نییە بۆ گەنجیتان حەمەد تۆ چوار منداڵی وەك دەستەگوڵت هەن، وەرە و دەست لەو کارە هەڵگرە. هەرچی لێرە بڕوا جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە. ئەگەر بشگەڕێتەوە وەکو من بە نەخۆشییەوە دەگەڕێتەوە.

حەمەد گوتی:

- هیچ چارەیەکمان نییە.

هۆسۆك گوتی:

- ئێمە هەموو ئەوانە دەزانین براله. بەلام هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە.

وسوو گوتی:

- تەنیا ئەوانەی چوکوراوایان دیتوە دەزانن. من شارەزای چوکوراوام.. . لەویٚ ئاگر دەباریٚ. پڕ لە کرم و گەرمایە، هەر تەپۆیەکی گورگێکی خوێن خۆرە.. . وەکو هەور دێن. یەك دڵۆپە خوێن لە لەشی بنیادەمدا ناهێڵن. چوکوراوا تەندوورە.. . تەندوور.. . وەرن دەست هەڵگرن. حاڵ و ژیانی من ببینن.. . لەپێش چاوتانم. وەرن و مەڕۆن. ئاوەکەی کرماوییە. شلویٚ وەکو خوێن.. . مەڕۆن برادەرینە، ئەمن برایانە پێتان دەڵێم، باوکانە ئامۆژگاریتان دەکەم. حاڵ و ڕۆژگاری من ببینن.. . وەمێنن و لەبرسان بمرن، بەلام مەڕۆن.. . تەنانەت ئەگەر لەبرسانیش مردن.. .

لەوێ کار هەیە، پارە هەیە، سەری مار و مێرووی لێیە، ئەوەی بتانەوێ لێیەتی. بەلام مردنیشی لێیە. پەرێشانی و نۆبەتێشی لێیە. حالی من ببینن. چوکوراوا تەندوورە، تەندوور،.

وەرن و مەڕۆن.

هۆسۆک:

- هیچ چارەیەکمان نییە، دەبێ بڕۆین. ئێ مردین، مردین.

حەمەد:

- دەڕۆین.

هۆسۆک:

- مردن لە نەبوونیی باشترە. نۆبەتێ لە نەبوونیی باشترە. هەتا سیلیش لە نەبوونیی باشترە.

حەمەد گوتی:

- دەڕۆین.

وسووگوتی:

- حالّ و ژیانی من ببینن. ئەمن نایەم، ئەگەرجارێکی تر بچمەوە ئەوێ، بە زیندوویی ناگەڕێمەوە. خودا بە نسیبمان نەکا، ئیدی ناچم، خەلّقی داران دەخۆم. توێکلّی داران دەخۆم، بەلام ناچم.

حەمەد گوتی:

- ئێمەدەچین.

هۆسۆک گوتی:

- مردن لەنەبوونی باشترە. ئێمە دەچین.

وسووگوتی:

- حالّ و ڕۆژگاری من ببینن.

بەدەستی ڕاستی لێکدا لێکدا ورگی نیشان دەدان. ورگی وەك ورگی ئافرەتی دووگیان وابوو. ملی وەك داوەدەزوو باریك بوو، لێوە گەورەکانی داچۆڕابوون. لەبێ خوێنیان ڕەنگی بە ڕوانەوە نەمابوو. جلکەکانی شڕوپینەکراو بوون. لاقە پێخواسەکانی قەلّشێکی گەورەیان تێ ببوو. وەك لاستیکی ئۆتۆمبێل.

هۆسۆک:

- مردن هەیە و گەڕانەوە نییە.

وسوو:

- ئەمن برایانە پێتان دەڵێم، هەر تەپۆیەکی... .

هۆسۆك:

- توخوا لێودبڕە، وسوو.

وسوو ئیتر زاری هەڵنەپچڕی.

لێفە تێکەوە پێچراوەکانیان بەکۆڵدادا بوو، داسەکانیان دەپشتێوە کردبوو و چاوەڕوانی حەمەدیان دەکرد. حەمەد لەگەڵ ژنەکەی خەریکی قسەکردن بوو. سەرەنجام گوتی:

-بەخوام سپاردی.

-وەڕێکەوت.

ژنە لە پشتەوەڕا گوتی:

- تۆوەکان هەموویان ڕزیون.

دنیا خەریك بوو ڕووناك دەبوو، وەدرەنگ کەوتبوون. وەڕێکەوتن. تا ئەوکاتەی گڵەسپیی سەربانە نزمەکانی ئاواییان لێڕا ون بوو، ناوەناوە ئاوڕیان دەدایەوە. بەڕێ کەوتن و دوورکەوتنەوە. وا دەڕۆیشتن کە خاکی ژێر پێیان دەبوو بە تەپوتۆز. لە دواوە گوێیان لە دەنگێك بوو، ڕاوەستان. وسوو بە غاردان و هەناسەسواری خۆی گەیاندنێ. گوتیان:

- ئیشاڵڵا خێرە، وسوو.

وسووگوتی:

- خێرە.

لەسەر زەوی دانیشت، سینگی وەکوو کورەی ئاسنگەران دەهەندمی، گوتی:

- کەمێك ڕاوەستن. با کەمێك بحەسێمەوە. لەگوندی ڕا تائێرە غارم داوە.

بەسەر سەری وسووەوە ڕاوەستان. پاش ئەوەی هاتەوە سەرخۆ هەستایە سەرپێ و بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- دانیشتم بیرم کردەوە و پاشان دواتان کەوتم. کورد گوتەنی:( مردن جارێکەو شیوەن جارێك!)... مردن... بابڕۆین.

لە ئاسمان بچووکترین پەڵەهەور دیار نەبوو. خۆڵی ژێر پێیان خۆڵەمێشی دەنواند. بەتەنیشت کێڵگەیەکدا تێپەڕین، داهاتنەوەو زەوییەکەیان هەڵکۆڵی و گوتیان:

- بەکەڵك نایە. نابیتێ. .

- تازە ئەگەر بشبێتێ، بەچی دەچێ؟هەتا ئەو بستە گیایەی هەڵیدەکەنی، نە پەنجەت پێوە دەمێنن نە نینۆك. سەرەنجام ئەگەر دوو مشتت دەست کەوێ، بەکەڵکی چی دێ؟

هۆسۆك:

- پێم خۆشە هەر نەبێتێ.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەگەر بووبایە زۆرباش دەبوو، بەهەرحاڵ لە هیچ هەر باشتر بوو.

وسووگوتی:

- یارەبی چوکوراوا کاول بێ.

هەموو پێکەنین.

گەیشتنە (ئاق پینار-کانییە سپی) دانیشتن و حەسانەوە. دەست و چاویان شردو ئاویان خواردەوە. پاش کەمێك حەمە چکۆل، شوانی کەکلیك ئۆغلووبان دیت، هاتە بەر دەمیان و لەبەرامبەریان ڕاوەستا.

هۆسۆك گوتی:

- ها حەمەد تۆ لێرە چ دەکەی؟

حەمە چکۆل گوتی:

- دەمەوێ بچمە چوکوراوا، بیستم کە بڕیارە ئێوەش بچن. دوو ڕۆژە لێرە چاوەڕوانتانم. من ئیدی دەمەوێ بڕۆم، ئێستا با ئاغا بگەڕێ و شوانێکی وەك من پەیدابکا. سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم.

حەمە کوڕێك بوو، درێژو ڕەقەڵە، بەڵام دەست و پێی بەشێوەیەکی باوەڕ پێنەکراو گەورەبوون.

ئاشق عەلی گوتی:

- حەمەد کارێکی باشت کرد، لەوەتەی بەبیرم دێ تۆ لەماڵی کەکلیك ئۆغلووی.

هۆسۆك گوتی:

- هیچ هەق وکرێیەکیش. وانییە؟

حەمە چکۆل گوتی:

- ئیدی ماندووبووم. لەژیان بێزاربووم.

هۆسۆك:

- هەموو ڕۆژێش داركاری.. .

ئاشق عەلی:

- گیانی خۆت نەجات دا.. .

حەمە چكۆل:

- لەچوكوراوا هەقی خۆم دەدەنیٚ؟

ئاشق عەلی:

- چوكوراواش ئی كەكلیك ئۆغلووەیە.

هۆسۆك گوتی:

- ئێستا بابزانین.

حەمە چكۆل:

- كرێیەكەم.. . .

حەمەدی دیكە گوتی:

- مەترسیٚ.

حەمە چكۆل گوتی:

- جووتەگایەكی شاخ درێژ دەكڕم.

وسوو گوتی:

- یاڕەبی چوكوراوا وێران بیٚ.

ئاشق عەلی:

- باشە، بگەڕێوە!

- خودا سەبەبكاری كوێركا.

حەمەدی گەورە، واتا حەمەدەكەی دیكە گوتی:

- من ئاغاژنێكم هەیە، هەموو چوكوراوا دێنیٚ. عەرزی بەخزمەت و بكەم، ئاغاژنەكەم هەموو چوكوراوا دێنیٚ. نازانن ئاغاژن چەندە منی خۆشدەوێت.. . یەكسەر دەچینە سەر كێڵگەی ئەوان. خۆتان دەبینن كە ئاغاژنم لە سەرانسەری چوكوراوادا وێنەی نییە. تا پایز لەویٚ كاردەكەین.

ڕۆیشتن. شەوێك لە(چامووڕلوو)نووستن. كاتێك لەویٚ ڕۆیشتن گوتیان:

- ئەوگوندەی چامووڕلوویە لە دنیادا تاکە، بۆ غەریبان هاوتای نییە..

لە دەشتەکە تێپەڕین و لەگردەکە سەرکەوتن و شۆڕبوونەوە. لەسەرکانییەك دانیشتن، کە پڕبوو لە وردە بەردی سپی، نان و پەنیریان خوارد. بۆنی پنگ مەستی کردن. لەسەر گیای قەیتەران درێژبوون. بۆحەسانەوە سیگارێکیان پێچایەوە. لە(مازقاچ) تێپەڕین. لەمازقاچ گوڵە زەردە هەموو شوێنێکی پڕکردبوو. لێرەوار وڕە وڕی دەهات. لە(چیچەك داغی) ڕەشماڵی هەوارچیانیان چاوپێکەوت، دووکەڵیان لەسەر هەڵدەستا. کیژەکان بە بەرهەڵبێنەی سوورەوە، مەشکەیان دەژەند. لە(سێرین قاچ) توشی کوردێکی سەر ڕووت و پێخواس بوون. کەرێکی وەپێش خۆیدا بوو، ژن و پێنج منداڵەکانیشی لەدواوە دەڕۆیشتن. منداڵەکان و ژن و کابرا کوردە، ئەوەندە کزو دژوێن بوون، ئەگەر فوت لێکردبان بەلادا دەهاتن. سەروسیمایەکی پەرێشانیان هەبوو. دەتگوت لە گرانییە ڕزگاریان بووە. سڵاویان کردو تێپەڕین. بەکورتی پاش دوو ڕۆژان گەیشتنە چوکوراوا. ئاوە زولاڵەکەی (ساورون) بەجۆش و خرۆشەوە دەڕۆیشت.

لەپشت (دیکرلی) لەژێر دارێك بە ئاسوودەیی لێی نووستن. کاتێك خەبەریان بوودوە، نیوەڕۆ بوو. حەمە چکۆل بەچاوی خەواڵووەوە، هاتە لای حەمەدی دیکەو بەگوێیدا چرپاند:

- مام حەمەد، لەوێ هەقی من ناخۆن؟

حەمەدگوتی:

- مەترسێ.

حەمە چکۆل بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- بەڕاستیتە، لەوێ هەقی خۆم بەتەواوی دەدەنێ؟

حەمەدگوتی:

- دەڵێم ترست نەبێ.

حەمە چکۆل:

- دووگا جووتی شاخ درێژ دەکرم.. زۆر کاردەکەم.

حەمەد:

-مەترسێ، لەوێ هیچ کەس وەك ئاغاژن نییە.

لێفەکانیان بەکۆڵ دادا. ئاشق عەلی سازە گوڵینگەدارەکەی هەڵگرت.

حەمەد:

- کێڵگەکە لەو خوارەوەیە. ئێستا دەگەینێ. ئاغاژن کە چاوی پێکەوتم، لەخۆشیان سەری سووردەمێنێ. لە منداڵەکان دەپرسێ، لە خێزانم دەپرسێ. چەند ساڵ لەمەوبەر دوو کراسی دان بە خێزانم، ئێستاش هەرلەبەریان دەکات. کەوایەکی زۆرچاکیشی دا بە من.. . ئێستاش هەرکە گەیشتینە ئەوێ دەستم دەگرێ و دەڵێت: (فەرموو.. . ) باشترین کارم دەداتێ. هەتا پایز کار دەکەم.

هۆسۆك:

- ئاغاژنی تۆ لەچوکوراوادا وێنەی نییە؟

حەمەد:

- بەئاغا دەڵێت، کە یەك بەرابەرو نیوی خەڵکی کرێمان بداتێ، دەڵێ ئەوانە برادەری حەمەدی منن.

ئاشق عەلی:

- خوا بکا وابێ.

حەمەد:

- هیچ کەس ناگاتە ئاغاژنی من. ئێستا بۆ خۆتان دەیبینن. هەرکە گەیشتین یەکسەر سفرەمان بۆ ڕا دەخات.

حەمە چکۆل:

- هەقی منیش.. .

حەمەد:

- مەترسێ.

حەمە چکۆل:

- ئی شاخ درێژ.

حەمەد:

- ئەمن دەبەر ئاغاژنێ خۆ مرم. ئاغا ئەگەر غیرەتی هەیە، با هەقی کەسێك بخوات. ئاغاژن لەپێشی ڕادەوەستێ و دەڵێ: (لەخوای بترسە. چما دەکرێ هەقی ئەو بەستەزمانانە بخۆی.. .؟) ئاغاش دەستبەجێ کرێی هەمووان بە تەواوی دەدات.

ئاشق عەلی:

- ئەگەر وابێ، ئەمنیش دەبەر ئەو ئاغاژندی مرم.

حەمە چکۆل:

- ئی شاخ درێژ.

هۆسۆک:

- قۆچەکانی بە.. . هەی قۆچەکانی، هەی قۆچەکانی!.. .

حەمەد:

- ئازاری مەدە، بەستەزمانە لەوەتەی لەدایك بووە لەماڵان گەورەبووە.

ئاشق عەلی:

- کارت بەکاری کوڕەکە نەبێ.

حەمە چکۆل:

- زۆرکاردەکەم.

حەمەد:

- دوو گاجووتم هەبوون، وەکو چاوی خۆم دەمپاراستن، ئاغاژن دەیگوت: (حەمەد لەنێو هەموو کاردارەکاندا، هیچیان ناتوانن وەکو تۆ خزمەتی گایەکان بکەن. ئەدی ئاغاژن وای دەگوت. کاتێك ویستم بگەڕێمەوە گا زەرد دەگریا.

ئاشق عەلی:

- با بزانین.. . با بزانین حەمەد!

حەمەد:

- کوڕم بمرێ ئەگەر درۆبکەم. کاتێك خەریکی گەڕانەوە بووم، ملی بەلاوەنابوو و خۆی دەلستەوە. ئێستا بۆ خۆتان دەیبینن. گازەرد هەر کەچاوی پێکەوتم دەمناسێتەوە. لەخۆشیان شێت دەبێ. دەبۆڕێنێ. ئێستا بۆ خۆتان دەیبینن.

ئاشق عەلی:

- خوا بکا وابێ.

حەمەد:

- تەنیا ئاغاژن.. . . لەژێر سێبەری ئاغاژن کاردەکەین و پارە پەیدادەکەین.

حەمە چکۆل:

- من جووتێك گا دەکڕم. وەکو گازەرد خۆشی بوێم.

هۆسۆک:

- دەیکڕی، دەیکڕی.. .

ئاشق عەلی:

- واز لە کوڕەکە بێنە. لە تەمەنی خۆیدا ڕۆژێکی خۆشی نەدیوە. ئێستاش منداڵە.. .

هۆسۆك:

- زۆر باشە، وازی لێدێنم.. .

حەمەد:

- کاردارەکانی دیکە ساڵ دوازدەی مانگ بەشۆربا و خواردن زگیان بای دەکرد. بەلاَم ئاغاژن بابۆڵە ڕۆنەکەرەی دەدا بە من، ئەوەندەی خۆشدەویستم.

گەیشتنە کێڵگەکە. حەوشەی خانووە دوو نهۆمەکە پڕبوو لە تراکتۆری شین و سوورو زەرد. دەڕاسەو گالیسکە، گەلابەو جیٚب، کە لەژێر تیشکی خۆردا دەبریسکانەوە.. . (مسی-هەریسۆن) و(فۆرگسن) و چەندان مارکەی دیکە.. .

چەند کەسێك بە سەروسەکوتی ڕۆناوییەوە بە دەوری تراکتۆرەکاندا دەهاتن.

حەمەدگوتی:

- ئەوەش ئاغاژن.

چووەپێش. ژنە پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو، دەستووری بەنانکەرەکان دەدا، کە نانیان دەکرد. ژنێکی قەڵەوی ورگ زل بوو. قۆڵی پڕبوون لەبازنەی زێڕ. حەمەد لیٚی چووەپێش و لەپەنای ڕاوەستا. ژنە هیچ گوێی پیٚ نەدا. حەمەد کەمێکی تریش لیٚی چووەپێش. بەپێکەنینەوە چاوی تێبڕیبوو.. . ژنە هیچ گرنگییەکی پێنەدا. حەمەد سەری سووڕمابوو، هێشتاش خەندە ئاشناییەکەی هەر لەسەر لێوان بوو.. . هەر چوار برادەرەکەشی کەمێك دوورتر وەستابوون. هەر سەیرێکی حەمەد و سەیرێکی ئاغاژنیان دەکرد. حەمەد نەیتوانی پێش بە خۆی بگریٚ وگوتی:

- ئاغاژن! منم، حەمەد!

ژنە تەماشایەکی سەرتاپای کرد. حەمەد گوتی:

- ئاغاژن ئەمن حەمەدم. هەمان کاردار.. . ئەوەی کە بەگازەرد جووتم دەکرد. ئێستاش بۆ دروێنە هاتووین، ئاغاژن، ئەمن حەمەدم.. .

ژنە سەری بەرزکردەوەو بێنەوەی تەماشای بکا، ڕووی کردە ئەو ژنەی نانەکانی لەسەریەك دادەنان گوتی:

- نانێکی بدەیە با بڕوات.

ژنە نانێکی دا بە حەمەد. نانەکەی بەدەستەوەبوو، لەجێی خۆی ڕەق ڕامابوو، دەتگوت تەنەکە ناوێکی گەرمت پێداکردووە، خوێنی لەشی وشك ببوو. ڕەنگی ڕوخساری ڕەش داگەڕا. لەسەرخۆ گوتی:

- ئاغاژن، ئاغاژن، ئەمنم، حەمەد. حەمەدی کاردار.. . گازەرد.. . ئەوەی کاتێك ڕۆیشتم ملی بەلاوەنا.. . گازەرد لەکوێیە.؟

ژنە گەڕایەوە بێ ئەوەی تەماشای بکات، لەپلیکانەی باڵەخانەکە سەرکەوت.

حەمەد کە نەیدەزانی چی ڕوویداوە، گێژببوو بەلارەلار، نانەکەی بەدەستەوەگرتبوو، گەڕایەوە لای هاوڕێکانی. هاوڕێکانی هیچیان پێنەگوت. پاش ماوەیەك ئاشق عەلی گوتی:

- بەهێندی مەگرە حەمەد گیان. ئێرە چوکوراوایە. ئێمە دەزانین. بەهێندی مەگرە، بریا توانیبات گازەردی ببینی. خوا دەزانێ بەستەزمانە چەندە خۆشحاڵ دەبوو.

بەرەو ئەولای کێڵگەکە ڕۆیشتن و پشتیان وەدیواری داو دانیشتن. هۆسۆك پیاوێکی بەخۆوە و بەهەیکەل بوو. ئاشق عەلی کزو باریکەلەو حەمەدیش باڵابەرزبوو.

کوڕێکی موو زەرد، کە جلوبەرگێکی دڕاوو ڕۆناوی لەبەردابوو حەمەدی دیت و بەغاردان هاتەلای. حەڤدەساڵان دەهاتە بەرچاو، دەستی حەمەدی گرت و گوتی:

- ئۆی.. . ی ی ی.. . مام حەمەد، بەخێربێی، بەخێربێی، نازانی چەندم وەڕەزی کردبووی. لەدڵی خۆمدا دەمگوت دەبێ ئەو مام حەمەدە لەکوێ بێ؟دوو ساڵ دەبێ دیارنییە؟ دڵم خەبەری دابوو، لەبەرخۆمەوە دەمگوت، هەرچۆنێك بێ ئەو ڕۆژانە پەیدا دەبێ. بەخێربێی، بەخێربێی. کوڕە لەخۆشیان وەهەناسەبڕکە کەوتبوو.

- شکور بۆ خوا، کە ئەوجاریش هاتییەوە. شکور بۆ خوا کە چاوم پێتکەوتەوە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت حەتمەن لەو یەك دوو ڕۆژانەدا پەیدا دەبێ، ئەوە بوو هاتی.

حەمەد گوتی:

- ئێستا وەرە با دانیشین.

کوڕە دانیشت. حەمەد گوتی:

- (ساری) دیتت ئاغاژن چی لەگەڵ کردم؟ هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد. لە دایکی خۆم چاوەڕوان دەکرد، بەڵام لەویم نەدەکرد. کاتێك کرێکارەکانی دیکە شۆرباویان دەخواردو زگیان هەڵدەمسا، ئەو بابۆڵەی ڕۆنەکەرەی دەدا بە من.

سەری ڕاوەشاند:

- هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد.. . ئەگەر بە خەونیش دیتبام چاوەڕوانم نەدەکرد. هیچ سەرم لێی دەرناچێ؟ گێژبووم ساری.. .

ساری گوتی:

- هەر مەپرسە مام حەمەد. هەر مەپرسە. ئەگەر بزانی چی ڕوویداوە، سەرت سووڕدەمێنێ و وشك دەبی. ئاغاژن ئەو ئاغاژنەی جاران نییە. لەوکێڵگەیەدا تەنیا من ماومەوە. ئەوانی دیکە هیچیان نەماون. ئاغاژن هەمووی دەرکردن.

حەمەد گوتی:

- چاوەڕوانم نەدەکرد. هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد.

ساری گوتی:

- دەڵێن ئاغاژن جادووی لێکراوە. ئەشق لەسەری داوە.

حەمەدگوتی:

- چی ی ی؟

ساری گوتی:

- لەکەللەی داوە. لەو ڕۆژەی ئەو تراکتۆرانە هاتوون، ئاشق و شێتی ئەو تراکتۆرانە بووە.

حەمەدگوتی:

- وەی ئاغاژنی بەستەزمان!

ساری:

- هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو کە لە خەو هەڵدەستێ، سەتڵە ئاوێك و پارووە سابوونێك هەڵدەگرێ و دەچێتە کن تراکتۆرەکان. تایەکانیان دەشوات، هەموو شوێنێکیان دەشوات و خاوێنیان دەکاتەوە. ئەگەر تۆزقاڵێك تەپوتۆز، یان قور ببینێ شێت دەبێ. هەموو ڕۆژێکی خوای دەیانشوات. دەڵێن ئاشق و شێتی تراکتۆرەکان بووە. لەکەللەی داوە.

حەمەدگوتی:

- وەی ئاغاژن وەی!

ئاشق عەلی گوتی:

- زۆر دژوارە، خوا بە نسیبمان نەکات، ئاشقیی زۆر دژوارە.

ساری:

- لەوەتەی تراکتۆر هاتوون، نە زستانێ ڕادەوەستێ نە هاوینێ، لە باخەڵ دەستی شۆفێر سواردەبێ و دەچێتە کێڵگە.. . هەموو ڕۆژێکی خوای.. . .

حەمەدگوتی:

- نەیناسیمەوە. بەستەزمانە. ئاغاژن بڵێ ئاوایە؟ کەواتە ئەو شتەی پێی دەڵێن ئەشق زۆر دژوارە.. . بەستەزمانە.. .

ساری:

- شێت نییە، هەر هەمان بنیادەمەکەی جارانە. تەنیا ئاشق بووە.. . . چۆن دەکرێ تۆ نەناسێتەوە.

حەمەدگوتی:

- هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد: تەنانەت بیریشم لێنەدەکردەوە. کەواتە تێکنەچووە، بەلام ئاشق بووە. خوا بە نسیب.. . .

ساری:

- ئەگەربزانی چی ڕوویدا! هەموو ڕۆژێ بە هەزاران کرێکار دێن و دەڕۆن. کرێکار وەك خیزو خۆڵ هەڵدەقولێن. ئاغاژنیش گێژبووە.. . نە بە ئاردی ڕادەگەن نە بەنان.. . هەر دەڵێ بیاندەنێ، بیاندەنێ.. .

ئاشق عەلی گوتی:

کەواتە ئاوایە؟ هێی ی.. .

ساری ڕووی لەحەمەدکردو گوتی:

- ئەگەر بزانی چی ڕوویدا.. . ئەگەر بزانی.. . (وەلیە زلە) (دووڕسوونە شەل).

حەمەدپرسی:

- چما کاك وەلیە زلە چی بەسەرهات؟

ساری:

- مەپرسە، هەر مەپرسە. ئەوەی نەدەبوو ڕووبدا ڕووی دا.

حەمەدگوتی:

- نوور لەنێو چاوانی دەباری، ئەوەندە بەگوڕکاری دەکرد، دەتگوت گەنجێکی بیست ساڵەیە.

ساری گوتی:

-ڕۆیشت هەموویان ڕۆیشتن. تەنیا من مامەوە. لەکاك وەلیە زلەی مەپرسە.. .
نیگەرانت کردم، بڵێ بزانم چی بووە؟
ساری گوتی:

- مام حەمەد کاتێك تراکتۆرهاتن، ئاغا هەموومانی دەرکرد. هەموو ملی ڕێیان گرت و ڕۆیشتن. کاك وەلیە زلە چوو لەپێش ئاغا ڕاوەستاو گوتی: (ئاغا، لەخوا بترسە. چل و پێنج ساڵە لەو ماڵەم ئاغا، شەرم لەخوا بکە، ئەمن ڕیشم لەو ماڵەدا سپی کردووە. پشتم لەوماڵەدا چەماوەتەوە. بەو تەمەنە بچمە کوێ؟ چی بکەم؟ لەگۆڕستانی ئێرە ژنەکەم نێژراوە. سێ کوڕم لێرە نێژراون، ئاغا. خودا لەئاسمانڕا بەردبارانت دەکات. ئەو تاوانەم لەگەڵ مەکە.. .

وەگوتی:(ئاغای بێدین! من تۆم بەباوەشی خۆم گەورەکردووە.. .لایەلایەم بۆ کردووی..

ئێستاش گووی تۆ دەبن نینۆکەکانمدا ماوە. ئەمن دوای ئەو هەمووساڵە بچمەکوێ؟..
)بەڵێ مام حەمەد وای گوت. گریاو ناڵاندی، زۆری قسە پێگوتن. دوو ڕۆژی تەواو لەسەر ئەو بەردە دانیشت. مووی ڕیشی ڕنینەوە. دەگریاو تووکی دەکرد. بێفایدە بوو، سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت، ئیدی هیچ خەبەری پەیدانەبوون. ڕۆیشت کە ڕۆیشت.

حەمەد گوتی:

- چەند پیاوی چاك بوو، ئەدی دوورسوونەشەل.؟
- ئەو ئێستا لە زیندانە. کارەکەی گەیاندییە زیندان.

حەمەد:

- شەلەو زیندان. هیچ شتی وای لێنەدەوەشایەوە.

- ئاغا هەموو کرێکارەکانی کۆکردەوە و گوتی: (ئیدی هیچ کارێکمان بە ئێوە نەماوە، بەخێرچن.. . . ) هەموو ڕۆیشتن. شەلەش ڕۆیشت. یەکدوو مانگ تێپەڕیبوون، ڕۆژێك سەیرمانکرد تراکتۆری (مسی هەریس) دینەمۆکەی پێوەنەماوە، لێکرابۆوە. پاترییەکەی مردبوو. ئاغاشێت بوو، چووە لای دەوڵەت، چووە لای پارێزگار، چووە ئەنکەرە. پاشان شەلە لەجێگایەك گوتبووی، واو وامکردووە. دەوڵەتیش یەخەی گرتبوو، شەلە گوتبووی: (لەڕقی ئاغا ئەو کارەم کردووە. سوپاس بۆ خوا کە تۆڵەی خۆم لێکردەوە. لێم کردەوە و لەقووڵترین شوێن کە لە (ئاناوارزا) یە، لەوێم هاویشت.. . قووڵترین گۆمی جەیهان ئێستا ئەگەر بشمرم خەمم نییە.)

ئێستاش ئەوە لەزیندانی (ئەدەنە)یە. ئاغا ناردی هەموو ڕووبارەکە گەڕان، بەلاّم نەیاندۆزیەوە. تراکتۆری (مسی هەریسۆن) مرد.

حەمەدگوتی:

- خەڵك کاری چۆنیان لەدەست دێت. شەلە هیچ قسەی نەدەکرد. لەگۆ فکرانڕا دەچوو.. .

ساری:

- هەموو ڕۆیشتن. بەتەنێ مامەوە. منیش خەریکبوو بڕۆم بەلاّم وەستا گوتی:(بەکەڵك ئەوکارەی دێت. ) ئێستاش دەمەوێ ببمە شۆفێر لەکن وەستای کاردەکەم.

حەمەدگوتی:

- ئەدی گازەرد چی بەسەرهات.؟

ساری:

- ئاغا هەمووگاکانی فرۆشتن. گازەردی تۆی لەگەڵ گابۆری کردنە قوربانی، ئەو ماشێنەی دەبینی؟ ئەو زلە پێیدەڵێن دەڕاسە. ئەو ڕۆژەی کە هێنایان ئاغا گازەردو گابۆری لەپێش تایەکانی کردنە گاوکەردوون و خوێنەکەی بە تایەکانی هەڵپژاند. بەڵێ گازەردیان کردە قوربانی بۆ ئەو دەڕاسەیە.

حەمەد دەگۆفکرانەوە ڕاچووبوو، بێدەنگ بوو.

ساری:

- ئەو دەڕاسەیەی دەیبینی؟ هەم دەدروێتەوەو هەم دەیکوتێ و هەم لەگونیانی دەکات و دەیخاتە بەردەست. ئیدی کارێك بۆ ئێمە نەماوەتەوە. هەموو ڕۆژێ کرێکار دێن و دەڕۆن. مرۆ زگی پێیان دەسووتێ.. . . وەستایەکەم ئەوەندەی پەرۆشن هەر مەپرسە.. . وەستاکەم دڵی زۆر بەو خەڵکە دەسووتێ.

ئاشق عەلی گوتی:

-پیاوی چاکە. هەموو کەسێك دەکرێ خەڵکی دەوڵەمەندی خۆشـ[illegible] ـەلاّم گرنگ ئەوەیە پیاو خەڵکی هەژاری خۆشبوێت.

ساری لەجێی خۆی هەستاوگوتی:

- ئێوە ئێستا برسیتانە. با بچم نانتان بۆ بێنم. یانی چێشت و بۆ بێنم.

پاش کەمێك بەقاپێکی گەورەی پڕ لەشۆرباو حەوت هەشت نووردوە نانەوە گەڕایەوە.

- ئەگەر شاگردی چێشتخانەکە لێرە بایە، هەڵواشم بۆ دێنان. بەلاّم لێرە نییە.

گوتیان:

- خوا بتپارێزێ. وەکو ئەوەی وایە هێنابت.

دوای ئەوەی نانەکەیان خوارد لەکێڵگەکە دوورکەوتنەوە. لێفەکانیان وەبن سەریداو یەکسەرخەویان لێکەوت. ساری بەیانی زوو نان و شۆربای بۆ بردن و گوتی:

- مام حەمەد، وەستا پیاوێکی زۆر باشە. لەبەری پارامەوە ئەگەرکارێکت بۆ وەبینێ، بەلاّم نەبوو، کارنییە.

حەمەد:

- خوا ئاگادارتبێ. ئێمەش هەرچۆنێك بێ کارێك بۆ خۆمان پەیداد‌ەکەین.

ساری ملی بەلاوەناو گوتی:

- ئیشاڵلاّ.

خۆر وەکو پارچەیەك ئاگری سوورەوەبوو، هەڵکشابوو تیشکە بەتینەکانی بە هەموو لایەکدا بلاّودەکردەوە. بە جادەکەدا، گەلاّبە بارهەڵگرەکان، ئەو تراکتۆرانەی سەرپۆشی پلاستیکیان بەسەرەوەبوو، داشقەو دەراسەو جێب و ئۆتۆمبێلی دوامۆدیلی ئاغاو دەستەدەستەی بچووکی ئەو کرێکارانەی ملیان کۆمکردبوو، تێدەپەڕین. گرۆهورێك بوو، کە پێشتر لە چوکوراوا نەبیسترابوو.

سێبەرە درێژەکانیان لەپێش خۆیانەوە بەسەر خاکی جادەکەدا درێژببوونەوە. لەلای ڕاستی جادەکە ژنێکیان دیت کە سەروچاوی بە کۆنەپەڕۆ داپۆشیبوو. ژنە ئەسپێکی کزو مردەلۆژەی بە جەنجەرەکەوە بەستبوو، کە پەراسووەکانی دەرپەڕیبوون. بە هێواشی بە دەوری خەرمانە چکۆڵەکەدا، دەسووڕایەوە. نە هەرزاڵی هەبوو، نە سێبەرێك. بەدرێژایی جادە هەورێك لە تەپوتۆز ڕاوەستابوو. ئەوان بەنێو تەپوتۆزدا دەڕۆیشتن. خۆڵەکە تا گوێزینگیان دەهات، لاقی دەسووتاندن. ڕقیان هەستابوو، هەر یەکە وجنێوێکی تەڕیان حەواڵەکرد. وسوو وردە وردە حاڵی خراپتردەبوو. گوتی:

- یارەبی چوکوراوا کاول بێ.

سێبەرەکانیان کورتتربببوونەوە، گەیشتبووە سەر نووکی پێیان. تینوویان بوو، لەهاوینی چوکوراوا ئاو کوا پەیدادەبوو.زمانیان بە مەلاّشوویانەوە نووسابوو. بەهیوای ئەوەی ئاوێك پەیدابکەن وەڕێکەوتن. شوێنەواری هیچ گوندو ئاوەدانییەك دیارنەبوو. دەستە دەستە لەکرێکارانی بێکار بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕین. پیاوە ماندوو و بێئومێدەکان، مل کۆم و لاچاو

تێك قوپاو دەستیان بەخۆدا بەردابوونەوە، تەنیا چاوو ددانیان لەنێو تەپوتۆزدا دەبریسکان. گۆرەوی پڕ نەخش و دڕاویان لەپێدابوو، ئارەق لەپشتی کراسەکانیانەوە هاتبووەدەرێ.. . هەر سلاوّیان کردو سلاوّیان سەندەوە.

خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان بوو، مێشکی دەبرژاند، گێژببوون. لەلایەك تینوێتی و لەلایەکی دیکەش گەرماو لەلایەکی تریشەوە دلتەنگی. لەدوور لەپێش خۆیانەوە گرەگری دەراسەیەکیان گوێ لێبوو. پیاوێکیشیان چاوپێکەوت، سەرگەرمی گێرەکردن بوو، ئاشق عەلی گوتی:

- وەرن با بچینەوێ.لای ئەو کابرایە ئەگەر ئاوی هەبێ دەماندات‌ێ.

بەنێو پەرێزێکدا تێپەڕین، کە دەراسە درووبوویەوەو لاسکەکانی فرێدرابوون. خۆر بەسەر کێلگەکەو بەسەر لاسکە گەنمەکاندا تیشکی داویشت و هەموویان لەژێر ئەو تیشکەدا ڕەق ڕامابوون. نەیاندەتوانی چاوهەلێنن و پێش خۆیان ببینن.

پیاوەکە لەگەلّ ژنەکەی و دوو کچی دوازدە سالّە، ئەسپەکانیان لەسەر جێخونەکە ڕاگرتبوو، خەرمانەکەیان بەبادەکرد. دەم وچاویان به تەپوتۆز ڕەش داگەڕابوو، تەواوی لەشیان نوقمی کاو تەپوتۆز بوو، پیاوەکە بەرۆکی لێ ئاوالاکردبوو و خەرمانەکەی وردە وردە بەبادەکرد، ئەوانی دیکەش کایەکەیان هەلّدەدایەوە سەرێ. ئەسپەکانیش لمۆزیان دەنێو کایەکە رۆکردبوو کرم کرم دەیانخوارد. پیاوەکە شەنەکەی لە خەرمانەکە چەقاندو هاتەلایان. مووی درێژی سینگی سپی بوون، دەماری باسکەکانی دەرپەڕیبوون. بە پشتی دەستی ئارەقەی نێوچەوانی سڕییەوە.

ئاشق عەلی گوتی:

- تینوومانە.

پیاوەکە لەو تۆنگەیەی لەناو عارەبەکەدابوو، قەدەلّەیەکی پڕکرد لەناو وێیدان. ماوەیەکی باش بە ئیشتیاوە خواردیانەوە.

ئاشق عەلی گوتی:

- لەتینوان خەریکبوو بخنکێین.بەلاّم نەمانویست بچینەلای ئەو پیاوانەی ئەو دەراسەکە لێدەخورن، داوای ئاویان لێبکەین، پێموایە ئەوانە جۆرێکی وان، دەلّێی چاویان ئێمە نابینێ.

کابراگوتی:

- فەرموو دانیشن.

ئاشق عەلی گوتی:

- خودا عافووت بکا.

هۆسۆك گوتی:

- زەحمەت نەبێ ناوی جەنابت.

کابرا گوتی:

- خەلیل.

هۆسۆك گوتی:

- ئەوە ئاشق عەلییە. ئەوەشیان ناوی حەمەدە، ئەوەی دیکەشیان هەر حەمەدەو ئەوەش وسووە، منیش هۆسۆکم.

کابراگوتی:

- کار دەست ناکەوێ.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئێمەش تازە هاتووین، ئەوە بەدوای کاردا دەگەڕێین.

حەمەدگوتی:

- ئیشاڵلا پەیدای دەکەین.

کابرا:

- تازە ئێمە نامان پێ پەیدانابێ.

ئاشق عەلی:

- پێم سەیرە.

کابرا:

- ئاغا خەبەری ناردووە،کە: (ئیدی بەسە، تا ئێستا لەکن من ژیاون. ) گوتبووی: (سی ساڵە زەوییەکانی من ڕەنێودێنن، دەڵێی ماڵی بابیانە، دەبێ بەجێی بێڵن. ئیدی بەسە، ئەوەی بەدەستیشیانەوە چێشتوومە.. . ) تازە کارێك بۆ ئێمە نەماوەتەوە، ئەوە نەبێ توورەکە بەردێکی لەملی خۆمان بکەین و خۆمان لە چۆمی باوێین.

ئاشق عەلی گوتی:

- پیاو سەری لێدەرناکا.؟

کابرا:

- من سی ساڵە ئەو کێڵگەیەی دەکێڵم. لەهەر بستێکی ئەو زەوییەی، قاپێك ئارەقی نێوچاوانی لێرژاوە. وامدەزانی دۆخەکە هەروا دەمێنێتەوە و هەمیشە دەتوانم کاری لەسەربکەم و نیوە بەنیوە لەگەڵ ئاغا هاوبەش بم. بەو سەمەرگییەی ڕازیبووم. ئێستاش جگە لەوەی خۆمان لەداربدەین، هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە.. . زۆرداریيە.. . تاوانە.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- تاوان کە هیچ.. . مردنە.

کابراگوتی:

- شیوەنە.. . شیوەنی مەرگە.. . بەیانی مەکینە سووری دێنێ و لە زەوییەکەی بەردەدا.. . لە هەر بستێکی لوێچێك ئارەقی نێوچاوانی منە.

ئاشق عەلی گوتی:

- زۆر ڕاست دەکەی.. . لە مردنیش خراپترە.

کابرا گوتی:

- لەدوای ئەوە من چیم پێدەکرێ.. . لە جوتیاری زیاتر دەتوانم، چ کارێك بکەم، تاوانە.. . ستەمە.. . ئێوە زەویتان هەیە، با بێ بەرهەمیش بێ. لانی کەم ماڵ و ژیانێکتان هەیە.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- هەمانە.

هۆسۆك گوتی:

- خۆزگە نەمانبایە.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەو قسانە مەکە، هەمانە.. .

کابرا سەری ڕاوەشاندو گوتی:

- بریا منیش کاولە خانوویەکم هەبایەو بستە زەوییەکم هەبا، با لە برسان مردباین.. . ئاخ بریا منیش.. . ئێستا ئەمن چی بکەم؟.. . ئاخ ئەو کافرە ئەمریکاییە.. . ئەو مهەندیسە(مارشاڵ).. . تاوانە.. . ستەمە.. .

ئاشق عەلی:

- خودا ئەگەر دەرگایەکی دابخا، دەرگایەکی دیکە دەکاتەوە.. .

کابرا گوتی:

- ئەی بابە. . چ دەرگایەك؟. .
ئاشق عەلی:
- نا، هەرچۆنێك بێ دەیکاتەوە. .
کابراگوتی:
- دەرگایەك نەماوە بکرێتەوە. . هەموو دەرگاکان داخراون. .
ئاشق عەلی:
- دەکرێتەوە. .
کابرا:
- ئەو ڕێگایەی پێیداهاتن، بینیتان. ژنێك هەیە بەتاقی تەنێ، گێرەی دەکات. .
ئاشق عەلی:
- دیتمان. .
کابرا:
- سێ ساڵ لەمەوپێش، دەراسەکەی ئاغا، لاقی مێردەکەی پەڕاند. ژنە بەخۆی و سێ منداڵی نۆبەتێ دار، گرفتارو سەرگەردان ماوەتەوە. ئێستاش ئاغا دەیەوێت ئەویش دەربکات. دە وەرەو دەرگایەکی دیکەی نیشان بدە. . تازە هیچ دەرگایەك نەماوەتەوە. .
ئاشق عەلی گوتی:
- وەڵلاهی بڵێم چی. سەری بێ رزق لەبن گڵدایە.
کابرا:
- کام ڕۆزی؟. .
هۆسۆك:
- باشە خۆ بەبێ ڕۆزیش نامێنێتەوە. .
منداڵێکی ساوا لەسوچێك، کە گوونییەکیان پێدادابوو، دەنگی گریانی هەستا.
کابراگوتی:
- ئافرەت وەرە وەیژیرێنە. .
ژنە لەگەڵ دوو کچەکانی، شەنەکانیان داناو هاتنە بن هەرزاڵەکە. ڕوخساری کچەکان وەکو ئاور دایسا. دوای ئەوەی، ئەوەندەی توانیان ئاویان خواردەوە دانیشتن. ژنە منداڵە ساواکەی هەڵگرت، پشتی لەوان کردو مەمکی دا بە منداڵەکە.

ئاشق عەلی گوتی:

- هەستن کورِینە، با هەندێك یاریدەی کاکمان بدەین.

بێجگە لەو سوو، هەموویان هەستان. لەماوەی کاتژمێرێکدا، خەرمانەکەیان سوورکردو هاتن لەژێر هەرزاڵەکە دانیشتن. کابرا گوتی:

- دەستتان خۆش بێ براینە.

ژنە لەو تووربێنەی کە بەچەڵەگی هەرزاڵەکە هەڵواسرابوو، ماستی چۆڕاوەی دەرهێناو ماستاوی سازکرد. هەموو خواردیان. کاتێك دەیانویست برِۆن، کابرا گوتی:

- خوا ئاگادارتان بێ.. . ئیشاڵڵا کارتان دەست دەکەوێت.

کاتژمێرێك دەبوو، لەلای ئەو کابرایەرِا وەرِێکەوتبوون. خۆر لەگەڵ ئەوەی بەرەو رِۆژئاوا شۆرِدەبوودەوە، واش پریشکی داویشت. لە خوار جادەکە دارتوویەکی کۆنەساڵی لێبوو، گەڵاێەکانی بە تەپوتۆز سپی ببوون. لەژێر دارتووەکە تراکتۆرێکی خۆڵاوی لێ رِاوەستابوو،کە سەرپۆشێکی پلاستیکی بەسەرەوەبوو. کن تراکتۆرەکە، کەسی لێنەبوو، هاتن و لەپێشی رِیزبوون. هۆسۆك لەماتۆرِەکەی نزیك کەوتەوە، ویستی دەستکاری بکا، ئاشق عەلی گوتی:

- هۆسۆك مەکە، لێی نزیك مەبەوە، وریای بە.

هۆسۆك کشایەوە. ماودیەکی باش بەدەوری تراکتۆرەکەدا، هەڵسوورِان و تەماشای ئەملاو ئەولایان کرد.

حەمە چکۆل گوتی:

- تەماشاکەن.. . تەماشاکەن. چ چاوێکی گەورەی هەن. برِوانن چۆن دەبریسکێتەوە.

هۆسۆك گوتی:

- خودا لەناوی بەرێ.

ئاشق عەلی بە رِقەوە گوتی:

- تفوو.. . خودا لەناوی بەرێ.

تفێکی پر بە زاری بە تراکتۆرە خۆڵاوییەکەداکرد. تفەکە بۆ خوارێ خزی و خەتێکی سووری لەسەر تراکتۆرەکە دروست کرد. وسوو گوتی:

- یارِەببی چوکوراوا وێران بێ.. . یارِەببی تراکتۆر لەقورِێ رِۆچن. تفوو.. .

حەمەدگوتی:

- یارِەببی پارچە پارچەبن و هەر پارچەیەی، بۆ شوێنێك بچن.. . تفوو.. .

حەمە چکۆل پاش ئەوەی کەمێك لە تراکتۆرەکە دوورکەوتبۆوە، گەڕایەوەو گوتی:

- خەبەری مردنت.. . ئیشاڵلاً دەمری.. . تفوو.. .

تفەکەی حەمە چکۆل نەگەیشتە تراکتۆرەکە. پیاوێکی کزو ڕەقەڵە، پانتۆڵێکی فشی خوری لەبەردابوو، کە تا سەرئەژنۆیانی هەڵدر ڕبوو، بەپێخواسی بەرەو ڕوویان دەهات. دەسرەیەکی کۆنی لەسەری بەستبوو، پشتی لەژێر ئەو لێفەیەی لەکۆڵی نابوو، دوولا هاتبۆوە. هەر هەنگاوێکی هەڵی دێنا، دەتگوت پێ لەسەر ئاسنی سوورەوەبوو دادەنێ. دەستبەجێ هەڵی دێناوە. زۆر بە سەیری دەڕۆیشت.

هۆسۆك گوتی:

- دەچییەکوێ براله.؟

کابرا دەتگوت لەخەو ڕاپەڕیوە، بە بێزاریەوە گوتی:

- بۆ جەهەننەم. !

هۆسۆك گوتی:

- باشت زانیوە.. . ئەو ڕێگایە یەکسەر بۆ جەهەننەم دەچێ.

کابرا یان گوێی لێنەبوو، یان گوێی لێبوو خۆی کەڕکرد. تێپەڕی و ڕۆیشت.

ئاشق عەلی گوتی:

- مەکە هۆسۆك، گوناهە. چما حاڵ و وەزعت نەدیت، لووتت گرتبا گیانی دەردەچوو. تۆ چت لەگیانی ئەو فەقیرو هەژارانە دەوێت.؟

هۆسۆك:

- بۆ چم گووتووە.

ئاشق عەلی گوتی:

- کارێکی باشت نەکرد. ئەگەر بەو خەڵکانە بڵێی (گیان) دەڵێن: (گیانت دەرچێ).

پاش کەمێك ئەو تراکتۆرەی دیتبوویان، لە پشتیانەوە بە تەپوتۆز تێپەڕی.

هۆسۆك ددانی لەچیرەوەبردن و گوتی:

- بڕۆ، بڕۆ نانی خەڵکی ببڕە، بڕۆ ماڵێ خەڵکی خەراکە.. . بڕۆ.. .

حەمەدگوتی:

- ئیشاڵلاً کارێکمان دەست دەکەوێ. دڵم خەبەری داوە، چما دەکرێ کارێکمان دەست نەکەوێ. هەر دەبێ پەیدای بکەین.

وسوو زۆر بەجێ مابوو. حەمەد گەڕایەوەو تەماشای کرد. وسوو لەسەر خۆڵی جادەکە دانیشتبوو، دەتگوت نوێژدەکا، دادەهاتەوە و ڕاست دەبۆوە.

حەمەدگوتی:

- وسوو چتە؟.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- بریا نەهاتبا، بەستەزمانە حاڵی باش نییە.

هۆسۆك توڕەبوو:

- پیاو ئاوا لێك هەڵوەشێ دێتە چوکوراوا؟ ئاپیاو هێندەی جنێو بە چوکوراوادا، واش هەر وەدوامان کەوت.

ئاشق عەلی گووتی:

- ئەو قسانە مەکە هۆسۆك. ئەو قسانە مەکە براله، چ بکا. وەدوای پاروە نانێکی کەوتووە، بیری کردۆتەوە ڕەنگە چەند قرۆشێکی چنگ کەوێ، بۆیە پێی بە جەرگی خۆیدا ناوەو هاتووە. چما ئاگای لەحاڵی خۆی نییە؟چ قوڕێك وەسەری خۆی بکا. ماڵی نەبوونیە خەرابێ.

- با نەهاتبایە، سەگبابە.. .

گەیشتنە لای وسووی.

ئاشق عەلی گوتی:

- هەستە سەرپێ براله. ئەوە چت بووە.. ؟

وسوو ئاڵاندی:

-( تا)م لە ئەژنۆیاندایە. ناتوانم برۆم. دڵم وا بەتووندی لێ دەدا، هەر مەپرسە.. .

ئاشق عەلی چوو بن پیلی گرت وگوتی:

- هەستە براله. هیچ نییە، هێندەش ناسك و نازدار مەبە.

وسووگوتی:

- هیچ نییە. زۆرجاران وام لێدێ. پیاو هەموو دەمێ.. .

پاش ماوەیەك هەستایە سەرپێ. ئێوارەبوو، خۆر دەچوو لەپشت کێوەکان ئاوابێ. لەلای ڕۆژئاوا دامێنی هەورەکان سوور دەچوونەوە. کەمێك لەولای خۆیانەوە، مەرەزەجاڕبوو. لەنێو مەرەزەکەدا، لەك لەکەکان لەسەر یەك لاق ڕاوەستابوون و دەگۆ فکران ڕاچووبوون، لەوانەبوو خەویشیان لێکەوتبێ. چەڵتووکەکە، بە ئەندازەی قامکێك لە گۆلەکان هاتبوونەدەر. ئاوێکی

زەرد بەبن لاقەکانیاندا دەڕۆیشت و دەچووە ناو چاڵاوێك، کە لەخوار مەرەزەجارەکە بوو. ئاوێکی زەردو پیس بوو.

هۆسۆك لەسەر چاڵاوەکە درێژبوو، قورتەقوورت ئاوەکەی خواردەوە. وسوو نەڕاندی:

- هۆسۆك، هۆسۆك، لەو ئاوەی مەخۆرەوە براله، ژەهرێکی تەواوە. مەیخۆوە. دەمری. مەکە براله مەکە. منیش لەو ئاوەم خواردەوەو تووشی ئەو حاڵەی بووم.

هۆسۆك گوێی نەدایە. تێری لێخواردەوە. پاشان ئاشق عەلی، حەمەد، حەمە چکۆل، هەموو ئاویان خواردەوە. وسووش هەروا لەبەریان دەپاڕایەوەو دەیگوت (ژەهرە) دەیگوت (مەرگە) دەیگوت (ژن و منداڵمان هەیە). بەڵام بێ سوود بوو. پشتیان وەچاڵاوەکەدا و دانیشتن. وسووش نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێ، سەرەنجام ئەویش لەسەر چاڵاوەکە دەستی دادان و قوورتە قوورت، ئاوی خواردەوە.

هۆسۆك گوتی:

- وسوو ئەتۆ بۆچی؟. . .

ئاشق عەلی قسەکەی پێ بڕی وگوتی:

- کارت پێی نەبێ، ئەو بەستەزمانە ئازار مەدە.

حەمەد:

- ئیشاڵڵا کارێکی پەیدادەکەین. دڵم خەبەری داوە. . . دەبێ کارێکی پەیدا بکەین.

هۆسۆك:

- پەیدای دەکەین. کارێکی باشیش پەیدا دەکەین. . . خەونت دیوە؟

حەمەد:

- دڵم خەبەری داوە.

حەمە چکۆل:

- دڵی منیش. . . گاجووت. . . ئی شاخ زەرد.

هۆسۆك:

- بێدەنگ بە، بێدەنگ سەگباب.

ئاشق عەلی:

- کارت بەکاری کوڕەکەی نەبێ.

هۆسۆك:

- پیاوی شێت دەکا. ئەوە نان نییە بیخۆین، ئەویش هۆش و بیری بووەتە گاجووت.

ئاشق عەلی:

- گەنجە.. . منداڵە، ئەقڵی پێ ناشکێ. بۆ ئەتۆش جحێڵ نەبووی؟

هۆسۆك:

- بووم، بەڵام گاجووت هیچ، بە تەمەنی خۆم تەنانەت گوێلکیشم بە خۆمەوە نەدیوە.

ئاشق عەلی:

- باشە، ئەویش وەکو تۆ.؟

هۆسۆك:

- ئەی بابە ئاشق. ئەتۆش وازمان لێ بێنە.

ئاشق عەلی:

- بەهەرحاڵ.. .

شەوداهات، تاریکی باڵی کێشا. ئاسمان دەتگوت بۆتە فەرشێکی پڕ لە ئەستێرە. ئەوەندە پڕ لە ئەستێرەبوو، کەوا دەهاتە بەرچاو لە ئەستێران دروست کرابێ.

هەموو بۆقەکانی نێو مەرەزەکە، دەیان قیڕاند و چەقەڵەکانی دەشتێش دەیان لووراند.

لێفەکانیان وەبن سەری داو لێی درێژبوون. تەپۆش بەکۆمەڵ و وزە وز، وەکو هەورێکی ڕەش، هێرشیان هێناو بەسەریاندا بارین. درێشووکەکانیان وەکو دەرزی، لەسەر جلکەکانیانەوە پێوەی دەدان. هەرچەند ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشتیان کردو تەپۆیان لەخۆ دەرکرد، بێسوودبوو.

تەپۆ بەهەر شوێنێکی وەدەدا، بلۆقی دەکرد، ئەوانیش کڕەکڕ خۆیان دەخوراند.

وسووگوتی:

- گوێ بگرن. بەو شێوەیە ناتوانین بنووین. ئەوانە تابەیانی لەبەریەکمان هەڵدەوەشێنن، تەپۆی ئێرە وەکو سەگ بنیادەم دەگەزن. بێسوودە، ئاوری بکەنەوە، کاتێك ئاگر هەبێ نایەن. لەبەر دووکەڵێ هەڵدێن.

هۆسۆك:

- ڕاست دەکا، منیش دەزانم. منیش هاوینێکی لە چوکوراوا بووم.

هۆسۆك باوەشێك قالۆری هێنان و لەنێوەڕاستێی دانان. شقارتەیەکی لێدا، ئاورەکە بڵێسەی سەند. کوێرەڕێیەك کە لەولای ئەوان بوو، وەکو گوریسێکی سپی ڕووناك بوو. ئاوی

چاڵەکەش ڕووناك بوو. کاتێك وسوویان لەبەر ڕووناکییەکەدا بینی، ترسان. زەردو ئیشك بوو، دەماری دەموچاوی دەرپەڕیبوون. زاری داپچڕیبوو.

هۆسۆك گوتی:

- تەپۆ لەبەر ڕووناکی هەڵدێن. تا بەیانی ناهێڵین ئاگرەکە بکوژێتەوە.

ئاشق عەلی:

- ناهێڵین بکوژێتەوە.

هۆسۆك:

- تەپۆی چوکوراوا.. .

ئاشق عەلی:

- دەزانم.. . ڕۆژێك ڕۆژگارێك کوڕە هەژارێك هەبوو.. . .

هۆسۆك گوتی:

-بیڵێ ئاشق بیڵێ. لەوەتەی هاتووینە چوکوراوا، نە ئاوازێکت گوتووەو نەسازێکت لێداوە.

ئاشق عەلی:

- ڕاست دەکەی.

وسوو ناڵاندی:

- ئای.. . ی ی ی.. .

ئاشق عەلی:

- ئیشالڵا چاك دەبییەوە براله.

هۆسۆك باوەشێکی دیکەشی قالۆرهێنان و خستییە سەر ئاگرەکە. لەبەرگەرمای هاوین و گڕی ئاگرەکە، بە جۆگەلە ئارەقیان دەڕشت. هۆسۆك دەستی لەسەر شانی ئاشق عەلی داناو گوتی:

- ئاشق عەلی، براله، دە تەواوی کە.

ئاشق عەلی سازەکەی هەڵگرت، خۆی گرمۆڵەکردو داستانەکەی دەست پێکرد:

- کوڕە هەژارێك هەبوو، خەلکی دەوروبەری ئێمەبوو، ئاشقی کچێك بوو، بابی کچە ڕازی نەدەبوو، دەیگوت: (دوو هەزار لیرە شیربایی بێنەو کچەی بەرە.. . ) کوڕەش، هەژارو پەرێشان، موحتاجی پاروە نانێکی بوو. ساڵەهای ساڵ وەکو سێبەر، بەدوای کچەوە بوو. کچەش ئەوەندە هۆگری کوڕەی بوو، هەرمەپرسە. شەوێکی کوڕە دەستی کچەی گرت و گوتی:

(وەرە بابڕۆین بۆ چوکوراوا. ) هاتنە چوکوراوا، کوڕە گەنجێکی بێ ئەزموون بوو. لەترسی پیاوانی دەوڵەت، نەکا بیانبیننەوەو لێکیان دابڕن، بەڕۆژ خۆیان دەشاردەوەو شەوانەش دەڕۆیشتن. بابی کچەی کابرایەکی دەوڵەمەندبوو، لە هەموو جێگایەك پیاوی خۆی هەبوون. کوڕە بەڕۆژ کچەی دەشاردەوەو بۆ خۆیشی، بۆ ئەوەی پاروە نانێکی پەیدابکا، دەچووە دێهاتەکانی دەوروبەر. ڕۆژێك کچەی لەپەنا مەرەزەجارێك، لەنێو قوولکەیەك دەشارێتەوەو بۆخۆیشی وەدوای نانی دەکەوێ.

کاتێك دەگاتە ئەو شوێنەی کچەکەی لێ شاردبۆوە، تاریك دادێ، سەیر دەکا کچە نەماوە. هەموو جێگایەك دەپشکنێ، بەلاّم شوێنەوارێك لەکچە پەیدا ناکا. تا بەیانی لەو دەوروبەرانە دەگەڕێت و دەخولێتەوە. تا بەیانی ئەشکی سوور هەڵدەوەرێنێ و هاواردەکا:(جەننەت، جەننەت!) جوابێك نابیستێ. کاتێك هەوا ڕوون دەبێتەوەو چاو چاوی دەبینێ، دەگاتە جێگایەك تەماشادەکا لەناو قوولکەیەك، مشتێك ئێسکی سپی دەبینێ.. . لەولاش کەزییەکانی وەکو دوو ڕەشمارو لەلایەکی دیکەش جلکە ونجر ونجرەکانی ئەو.. . . کوڕەش کاتێك چاوی بەوانە دەکەوێ، ئەقڵی لەدەست دەداو شێت دەبێ.. . دەیانگوت کچە تەپۆ، پارچە پارچەیان کردبوو، خواردبوویان. ئۆباڵ بەستۆی ئەوەی لێم بیستووە.. .

هۆسۆك گوتی:

- ڕاستە. ئێستا ئەگەر ئەو ئاگرە نەبایە، ئێمەشیان پارچە پارچە دەکرد.. .

حەمەد:

- هەر بەزیندوویی کەوڵیان دەکردین و دەیانخواردین.

ئاشق عەلی:

-کوڕە لەپەنا ئێسکەکان دانیشت و کەزییەکانی کچەی بەدەستەوەگرت و سەردوولکەیەکی دەستپێکرد.. .

هۆسۆك گوتی:

- بیلێ، دەبەرتمرم ئاشق بیلێ.

ئاشق عەلی سازەکەی بە سنگیەوە نووساندو بەسەریدا نووشتایەوە، سازەکە وەزمان هات و ئاشق تێیهەلکرد. دەنگێکی هەبوو، دەتگوت دەنگی ئاشق فەیسەڵە. ئاوری لەدڵی بەردەدا، ئاشق دەیچڕی و حازریانیش سەرتاپای لەشیان ببوونە گوێ. تەنیا ئاخیان هەڵدەکێشا. گۆرانییەکە تەواوبوو، ئاشق عەلی گوتی:

- کوڕە کەزییە ڕەشەکانی بەدەستەوە گرت و ڕۆیشت. دێ بەدێی چوکوراوا گەڕا، تووشی هەرکەسێك با، چیرۆکی خەم و پەژارەی خۆی بۆ دەگێڕایەوەو لاوانەوەی دەست پێدەکرد، خەڵك دڵیان دەبوو بە ئاو. خوا بە نسیبی دوژمنی ئینسانیشی نەکا.. .

پاشان ئاشق وەڕان کەوت. سازەکەی بە سنگییەوە ناو زیاتر کۆمبۆوە، بوو بە گلۆڵەیەك. هەموو لەشی بە ئەندازەی، منداڵێکی پێنج ساڵەی لێهات. دەنگە بە سۆزو زەنگوڵەکەی، شەپۆل شەپۆل سەرتاسەری چوکوراوای پڕکرد. دەنگەکە کزدەبوو، بەرزدەبۆوە، خەمناك دەبوو و دەگریا. لە کوێرەوەری دەدوا، لە ئەشق، لە مەرگ و نەبوونی، لە سیل و نۆبەتێ دەدوا. لەمنداڵی شیرەخۆرەو لە تەنیایی و ئاوارەیی دەدوا. لە(قیزل ئیرماق) و سەیحان و جەیهان و چوکوراوا دەدوا. لە تەپۆو لە تراکتۆری بێدین و ئەو دنیا وێرانە دەدوا. لەکێوە پڕ لە بەفرو پڕ لە سونبوول و ئاسکە چاو ڕەشەکان و لە زەوی و لە زۆرداری دەدوا. تا سیوادی بەیانی دا هەر چڕی. لەلای ڕۆژهەلاَت ئاسمان سوورهەڵگەڕاو نەسیمی بەیانی هەڵیکرد. سازەکەی بە هێواشی لە پەنا خۆی دانا. ئیدی لێوی لێك نەکردنەوە. ڕوخساری هێمن و دڵنیاو ڕووناك بوو.

گوتیان:

- ئاشق، ئاشق، خودا دڵشادت بکا. یارەببی نەبوو نەبی و ئەوەی دەستی بۆ دەبەی ببێتە زێڕ.

لەوێ وەڕێکەوتن. لەدوای خۆیان ئەو ئاگرەی هەڵیان کردبوو، هەروا دایسا. وردە وردە ئاورەکە، لەبەرچاوان ونبوو، لەدوور ڕا دووکەڵێکی باریکی لێهەڵدەستا. ئەو گوندەی پێیدا تێپەڕین(ئاق کوی) یان پێدەگوت. دیواری خانووەکان تەپاڵەیان پێدادابوون. سەربانەکان گیای وشك و قامیشیان، لەسەر بلاّوکردبوونەوە. خانووەکان لە بناری کێوەکە، لێك بلاّو ببوون. لەپشت سەری وانیشەوە، ڕەوە سەگێك بە وەڕینەوە دەهاتنە پێش. کاتێك بە پێش کاولەخانوویێکدا تێدەپەڕین، پیرەپیاوێکی پشت چەماوەی چاوڕیپۆقاوی بانگی کردن و گوتی:

- سەلام.

گوتیان:

- سەلام.

پرسی:

- لەکوێرا هاتوون و بۆ کوێ دەچن؟

حەمەد ولاّمی دایەوە:

- لە(ئوورۆم) ڕا هاتووین وبە دوای کاردا دەگەڕێین.
- کار بەری چ دارێکە.. . ئەگەر دەتوانن بڕۆن پەیدای کەن.
حەمەد:
ئیشاڵلا پەیدای دەکەین.
پیرەپیاو:
- چوکوراوا ئیدی چوکوراوای جاران نییە. تراکتۆر هەموو جێگایەکی پڕکردووە.
ئاشق عەلی:
- خوا بۆ خۆی بە هانای فەقیرو هەژارانەوە بێ.
پیرەپیاو:
- ئامین، ئامین. خودا ڕەحم بە هەموومان بکا.
- خوداحافیز.
پیرەپیاو پێشی پێگرتن و گوتی:
- ئەوە(وەلی) کوڕم، کێڵگەیەکی هەیە، لاسکەکانی بەسەریەکدا کەوتوون. دەڕاسە ناتوانێ بەرهەمی بەسەریەکداکەوتوو، بدرووێتەوە. ئێوەی خەڵکی کوێستانێ دروێنەکەری باشن.
حەمەد:
-بەڵێ. دروێنەکەری باشین.
هۆسۆك:
- دروێنەی دەکەین.
حەمە چکۆل:
- ئەمنیش دروێنەی دەکەم. ئی شاخ زەرد، وەکو تیشکی مانگ.. .
ئاشق عەلی:
- دیارە تۆش دروێنەی دەکەی. چما تۆ چت لە ئێمە کەمترە؟
پیرەپیاو وەرگێڕکەیەکی ڕەگەڵ خستن و ناردنییە ماڵی وەلی. وەرگێڕکەکە گوتی:
- کاك وەلی، ئەوانە بابت ناردوونییە لای تۆ، دروێنەکەرن. بابت گوتی زۆرباش دروێنەی دەکەن. ڕاست وەکو دەڕاسە.. . ئەدی.. .
پاشان لەکاتێکدا پانتۆڵە ڕەشە دڕاوەکەی هەڵدەکێشا، لەوێ دوورکەوتەوە.
وەلی گوتی:

- چەندم لێوەردەگرن.
ئاشق عەلی:
- با جارێ چاومان بە زەوییەکە بکەوێ.
پاش ئەوەی ئاویان خواردەوە، چوونەسەر کێڵگەکە. گەنمێك بوو تەقریبەن بیست دۆنمێك دەبوو. هەموو گەنمەکە وەکو حەسیر بەسەر زەوییەکەوە ڕاخزیبوو. تەنانەت لاسکێکیشی بە پێوەنەبوو.
ئاشق عەلی گوتی:
- حەیف، لەبەین چووە.
وەلی گوتی:
- کاتێك خودا نەیدا نابێ. داهاتێك بوو پڵێنگ نەیدەتوانی لێی دەرچێ، نسیبیش نەوەبوو. لاسکە گەنمەکان دەتگوت قامیشن. هەموویان بەسەریەکداکەوتوون، باش بوو هاتن.
درونەوەی بیست دۆنم زەوییەکەیان، بەبیست لیرە خەملاند. دەست بەجێ داسەکانیان سوین و وەنێوی کەوتن.
حەمەد گوتی:
- نەمگوت؟ نەمگوت کارمان دەست دەکەوێ؟ نەمگوت دڵم خەبەری داوە؟ تەماشای ئەو چوکوراوایەی کەن.. . بڕوانن چەند گەورەیە؟چما دەکرێ لێرەکار دەست نەکەوێ. هەر ئەوەندە بەسە کارت پێبکرێ.
هەموویان سەرگەرمی کارکردن بوون و خێرا خێرا، دەیان دروو. وسوو لەسەر بەردێك دانیشت بوو، خۆی گرمۆڵە کردبوو. داسەکەی ئەو حەمە چکۆل دروێنەی پێدەکرد. کاتێك وەلی بەرەومالێ دەڕۆیشتەوە تا خواردنیان بۆ بێنێ، حەمە چکۆل بە هێواشی لێی نزیك بۆوە، تفی زاری قووتدایەوەو گوتی:
- مامە هەقی منیش دەدەی؟.. . دوو گاجووتی شاخ زەرد.. . وەلی پێی سەیربوو. ڕووی لە دروێنەکەرەکان کردو گوتی:
- ئەوە دەیەوێت بڵێ چی؟ شێتە.؟
ئاشق عەلی:
- گوێی لێ ڕامەگرە، منداڵە.
حەمە چکۆل بە تووڕەیی گەڕایەوە ناو گەنمەکە.

هۆسۆك گوتی:

- چت بە کاك وەلی گوت کوڕە؟.. . تووتکە سەگ.. .

ئاشق عەلی گوتی:

-دەتەویست بلێ چی. حەتمەن پرسیویە چوکوراوا چەندەی تراکتۆر لێن.. . دەتەویست چی لێ بپرسێ!.. . وانییە حەمە؟.. .

حەمەچکۆل گوتی:

- بەڵێ ئەوەم لێ پرسی.

تا ئێوارێ بێ ئەوەی پشت ڕاست بکەنەوە، دروێنەیان کرد. خۆر تیشکی بەسەردا دەباراندن.

دروێنەکردنی بەرهەمی ڕاخزیو، زۆر بەزەحمەتە. پشتی ئینسانی دەشکێنێ. ئێوارێ وەلی لە ستلێکدا شێوی بۆ هێنان. دانیشتن و بە ئیشتیاوە نانەکەیان خوارد. تەنیا وسوو هیچی نەخوارد. ئەوەندەی لەبەری پاڕانەوە بێسوود بوو.

دوای ئەوەی نانەکەیان خوارد، هیچ ڕانەوەستان و دەستیان پێکردەوە. وا وەنێوی کەوتبوون و دەیان درووییەوە، کە دەڕاسەش پێیان ڕانەدەگەیشت. لای ڕۆژئاوابوون دیتیان وسوو هات. بە توڕەییەوە داسەکەی لەدەست حەمە چکۆل دەرهێناو دەستی پێکرد. تەواوی لەشی دەلەرزی. پێیان گوت:

- تۆ نەخۆشی وسوو، خراپتر دەبی. مات و پەرێشان لە نێوەڕاستی چوکوراوا دەمێنییەوە. نەتۆ مەدروو. ئێمە لەداهاتەکەمان بەشی تۆشی لێدەدەین. خۆکەرنین. هەرچۆنێك بێ ئێمەش پیاوین.

وسوو گوێی نەدانێ. هەروا بێ ڕاوەستان، بێ ئەوەی سەرهەڵێنێ بە لەرزو هەناسەبڕکێوە دروێنەی دەکرد. لەناکاو بەلاداهات و داسەکەی لەدەست بەربۆوە. ئاشق چوو وسووی ڕاستکردەوەو گوتی:

- مەکە براله، تۆ نەخۆشی.

وسووی بردە دەرەوەی پەرێزەکەو بۆ خۆی گەڕایەوە.

هۆسۆك ئاوری گرتبوو:

- کاتێك ئاوا خۆی تووش کرد، لەدڵەوە دەمگوت ئەو داسەی لەسەری ڕاکێشم. ئاخر سەگباب، کاتێك دەزانی نەخۆشی و خەریکە دەمری بۆچی وەدوامان کەوتی؟.. . لە شوێنی

خۆت کەوتبای.. . لەدێی مابایەوە. نەك هاتبایە ئێرەو بووبای بە بەڵای گیانی ئێمەو خۆمان پێهەڵواسی. ئێمە بۆ خۆمان.. .

ئاشق عەلی توڕەبوو گوتی:

- هۆسۆك، تۆ چیت لەگیانی ئەو بێ نەوایەی دەوێ؟.. . خۆ بە نان و ئاوی ئێمە نییە. چیت لەگیانی بنیادەمێکی نەخۆش دەوێت براله.؟ بۆ خۆت دەبینی کە خوا گرفتاری کردووە، ئێمەش گرفتاری بکەین؟.. .

هۆسۆك گوتی:

- لانی کەم وەك بنیادەمان لەسەرپێی خۆی ڕاوەستێ. بەو حاڵەوە دێ دروێنەی دەکا. ئەوە خەریکە دەمرێ واش دروێنەی دەکا.. . . چما ئەو نەبوو پێشی پێگرتین و دەیگوت چوکوراوا جەهەننەمە مەچوون. ئێستاش.. .

تا خۆرئاوابوو دروێنەیان کرد. بەڵام نەیانتوانی تەواوی بکەن. داسەکانیان دە پشتێوەکردو بەرەو ئاوایی گەڕانەوە. ڕۆژبایەکی توند هەڵیکردبوو. وەلی بەرەیەکی لەپێش دەرگا ڕاخست و لەسەری دانیشتن. لەولایان مانگایەك گۆلێك گیای تەڕو تازەی لەدەمدابوو، گوێلکەکەشی بە گوانەکانییەوە نووسابوو، ڕایدەکێشاو شیری دەخوارد. بۆنی توندی گیا بڵاوببۆوە.

وەلی لەقاپێکی گەورەدا برۆێشی هێنا، لەنێوەڕاستی دانا. برۆێشەکە بێ ڕۆنبوو. گوێیان نەدایە، بەپارووی گەورەوە خواردیان.

ژنەکەی وەلی زەیستان بوو، لەژوورێ لەنێو جێگادا درێژ ببوو. منداڵە ساواکەی لەپەنا خۆی لەسەر بێژینگێك، درێژکردبوو. وەلی سێ منداڵی دیکەشی هەبوون، هەر سێکیان نۆبەتێیان لێ بوو هەڵدەلەرزین. حەمە چکۆل کاتێك وەژوورکەوت هەمووی چاوپێکەوتن.

وسوو شەوێش نانی نەخوارد. دانەچۆقەیەکی گرتبوو، هەر مەپرسە. دەتگوت لەڕێگایەکی پڕ لە بەرد، ئەسپ چوارناڵیان لێ دەکرد. بێپسانەوە دەیناڵاند.

هۆسۆك گوتی:

- باشە بڵێ ئەمن ئێستا چی بکەم؟ئەو پیاوە خەریکە شێتم دەکا. لەنێوەڕاستی چوکوراوا گیرمان خواردووە، بە نەخۆشیێکی پەککەوتەوە.

ئاشق عەلی گوتی:

- پێش بە چارەنووس ناگیرێ. ئەوەی دەبێ ببێ، هەر دەبێ. دەبێ دان بەخۆماندا بگرین براله. چ کارێکی دیکەمان لەدەست دێت.؟ .. .

وەلی جێوبانی ژنەکەی هێنایەدەرو لەپێش دەرگا ڕایخست، بێژینگی منداڵەکەشی هێناو لەپەنای دانا. ڕۆژبا هەڵی کردو تەپوتۆزی بەسەر جێویانەکاندا وەرکرد.

کرێکارەکانیش لێفەکانیان لێك کردەوەو لەسەر بەرەکە لێی درێژبوون. ئەوانی دی کە نووستبوون، ئاشق عەلی و وەلی بە یەکەوە قسەیان دەکرد. وەلی گوتی:

- لێگەڕێ با بێو زەوییەکەم لێوەستێنێ. لێم وەستێنێ و نەجاتم بێ.. . تۆ وەرەدو کوێرەوەری ببینە، نە دەستت بمێنن، نە نینۆك و نەددان و نە پێ، ئەوکاتیش نیوەی داهاتەکەت دەمستێ کەسێکی کەی، کە دلۆپە ئارەقێکی لەسەر نەرشتبێ. ئاخر شتی وا دەبێ؟ ئەگەر مرۆڤ هیچی نەبێ هەزار جار باشترە. لەبرسان بمری باشترە. زەوییەکەم لێوەستێنێ و نەجاتم دات.

ئاشق عەلی وڵامی دایەوە:

- ئەو قسانە مەکە برا. تۆ بە هەڵەچووی، زەوی شتێکی دیکەیە.

وەلی:

- بەمەرجێك ئی خۆت بێ. بەڵام ئەگەر ئی خەڵکی دیکە بێ ئاوا ئەسیرت دەکا. لێرە ئەمن گیانی خۆمی لەسەر دادەنێم، ئاغا هەر ئاگاشی لێ نییە. تەماشاکە، بۆ خۆت حاڵ و ڕۆژگاری من دەبینی.. . لێگەڕێ بابێ زەوییەکەم لێوەستێنێ و نەجاتم دات. سەرەنجام درەنگ یا زوو لێم دەستێنێتەوە. لەوەتەی تراکتۆر هاتوون، ئەوانەی وەکو من نیوەی داهاتیان وەردەگرت هەموویان لەبەین چوون. تەنیا من ماوم، بمرم و نەجاتم بێ، هەرچی بەسەرم بێ لەو ژیانەی باشترە.. .

وەلی هەروا قسەی دەکردو جنێوی دەدا، بەڵام ئاشق کە زۆر ماندوو ببوو خەوی لێکەوتبوو هیچی نەبیست.

ڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆیە، لەدروێنەکە بوونەوە. داوای پارەی وردەیان لە وەلی کرد، پارەکەیان برایانە لەنێو خۆیان دابەش کرد. وسوو پارەکەی وەرنەدەگرت. ئاشق عەلی ڕەنگە سەعاتێك زیاتر لەبەری پاڕابێتەوە، تاتوانی پارەکەی پێوەربگرێ و لەگیرفانی هاویشت.

حەمە چکۆل هەرکە پارەکەی خۆی وەگرت، حاڵەتێکی سەیری پەیداکرد. پارەکەی بەدەستەوە گرت و هەڵی دەسوڕاندو تەماشای دەکرد. لە گیرفانی هاویشت و هێنایەوە دەرێ وتەماشای کرد. پاشان وە حەمەدی دا. ماوەیەك لێی وەرگرتەوە. دووبارە وێی دایەوە.

ئەوجاریش لێی وەرگرتەوە، پاشان لە گیرفانی هاویشتەوە. بە هیچ جۆرێك دەستی لەناو باخەڵی نەدەهێنادەر.

تەنیا جارجار پارەکەی دەردێناو تەماشای دەکرد. دەچووە پەنا حەمەدو دەیگوت:

- مام حەمەد. جووتێك گا دەکڕم، ئی شاخ درێژو دەیبەمەوە گوندەکەی خۆمان. .

هۆسۆك لەدەست حەمە چکۆل تووڕەببوو، خەریك بوو لێی بدا، بەلاَم ئاشق عەلی نەیهێشت.

پاشان گەڕایەوە سەر حەمە چکۆل و پێی گوت:

- ها حەمەد، ئەتۆش هێندە نەدی بدی مەبە.

حەمەدگوتی:

- ئەمن پێم نەگوتن کارمان دەست دەکەوێ و پارە پەیدا دەکەین. ئەمساڵ پارەی باش پەیدا دەکەین؟ ئەمن دڵم وایخەبەرداوە.

ئەشی دەتوانی بەهیچ شێوەیەك، منداڵەکانی و بزنە کوریّ لەبیرخۆی بەرێتەوە.

لەوە بەدوا سەرتاسەری چوکوراوایان بەپێ تەیکرد، زۆر شتیان دیت و بەسەر زۆر ڕووداوانیشدا تێپەڕین. دێیەك ئەما سەری لێنەدەن و ئاغایەك ئەما لەبەری نەپاڕێنەوە. لە چوکوراوا هەڵدەسوڕان و هەروا دەڕۆیشتن.

ڕۆژێك لەناکاو لەقوڕی مێرگێك کەوتن. تازە لە شۆفیری ئەو تراکتۆرەی کە ئەجاتی دان، زانیان کە ئێرە زەلە.

کرێکارانی بێکار، دەستە دەستە لەو دەشتە سەرگەردان مابوون. هەموویان وەکو ئەوان هەژارو برسی، هەموویان وەکو ئەوان گێژو خەفەتبار بوون. لەو جادانەی کە خۆڵەکەیان دەگەیشتە ئەژنۆیان، تراکتۆری شین و سوورو قاوەیی و دەڕاسە و گەلاَبەی گەورە، بەتەپوتۆزکردنەوە تێدەپەڕین. بە ئەندازەی ئەنگوستێك تۆزیان لەسەرکەوتبوو، ڕەنگە ئەسڵەکەیان لەژێر ئەو خۆڵەدا زۆر بە زەحمەت لێك دەکرانەوە.

تەواوی ئەو دەشتە لەژێر ئۆبەتێدا دەلەرزی. ڕوخساری مرۆڤەکان، زەردو ڕەقەڵە بوون. گیا وشك ببوو، گەلاَی لاسکەکان هەڵپرۆکابوون و ڕەنگیان گۆڕابوو. سەرانسەری دەشتەکە ڕەنگێکی زەردی سووتاوی هەبوو. زۆر مردوویان دیتن، کە لەسەر جادەکە کەوتبوون. لەیەکێك لە ئێوارەکان مردوویەکیان دیت، کە خۆڵی جادەکە لەشی داپۆشیبوو، ڕوخساری مردووەکە لەژێر خۆڵەکەدا ڕەنگی کارەبایی دەنواند. بەلەکەکانی هەڵکرابوون و پێیەکانی ڕۆچووبوون.

خەڵکەکە لەدوای هاتنی تراکتۆرەکان، لەناکاو گۆڕابوون وجۆرێکی دیکەیان لێهاتبوو. تەنانەت تەماشای ڕوخساری کەسیشیان نەدەکرد.

ئەو تراکتۆرانە کە نەیاندەزانی چییان لێبکەن، بە ناچاری دەیان پەرستن.

ئاغایەکی گەنجی یەکێك لەگوندەکان، بەبێ هیچ هۆیەك تفی لەڕووی ئەوان کردو بە هەموو ئەوکرێکارانەی کە ئەوساڵ ڕژابوونە دەشتێ، سووکایەتی پێکردن. هۆسۆك، ئەگەر ئاشق عەلی پێشی پێ نەگرتبا، پارچە پارچەی کردبوو. لە تووڕەییان سەری لەقەدی دارتووەکانی قەراخ جادەکە ڕادەکێشا، کە دەتگوت گەلاکانیان لەخۆڵ دروست کراون. هاواری دەکردو دەیناڵاندو جنێوی بە چوکوراوا دەدا.

دووبارە شتی زۆریان دیت. ڕووداوی باوەڕپێنەکراویان لەدوای خۆیان بەجێهێشت. دوو ڕۆژان بە برسێتی مانەوە. ئەگەر ئاشق عەلی نەبا، حاڵیان شپرزە بوو. چووە دێهاتەکان سازی لێداو نانی وەرگرت. ئەگەر جاری جاران بایە، دێهاتییەکان هەرچەند گرفتاریشبان، ئەویان لەسەر چاوان دادەنا. بەڵام ئێستا تەنانەت تەماشاشیان نەدەکرد. جاران لەبەری دەپاڕانەوە، کە سازیان بۆ لێدا.

لە تەپو تۆزدا نقووم ببوون، نارەقی پشتیان خۆڵەکەی کردبووە قوڕ. دەتگوت لەنێو زۆنگاو هاتوونەدەر. ئەوەی نەیان دیتبوو، دیتیان، ئەوەی بەسەریان نەهاتبوو، بەسەریان هات.

ئاشق عەلی زۆری گۆرانی لەسەر ڕەنج و ئازارو جادەی خۆڵاوی و ئاغای زۆردارو ئەو تەپۆیانەی کە وەکو مار پێوەدەن، سازکردن.

دەنگی ئاشق وا خەمناك ببوو، کە هەرکەسێك گوێی لێبایە، دڵی دەبرژاو لەخەم وخەفەتان جینگڵی دەدا.

بەڵام لەبارەی وسووی. باشتر وایە نە من هیچ بڵێم و نەئێوەش هیچ ببیستن. دڵی هیچ کەس تاقەتی بیستنی نییە؟ دڵی بنیادەم ئەگەر بەردیش بێ، کە چاوی پێبکەوێ دەبێتە ئاو.

دوو حەوتوان بەو حاڵە پەرێشانە، خۆی بەدوایاندا ڕاکێشا. جارجار تەواوی لەشی لە(تا) ئاگری دەگرت و جارجاریش خەریك دەبوو ڕەق بێتەوە. دەتگوت لەنێو بەفری کوێستانێیە.

دوای دوو حەوتوان، ئیدی نەیتوانی یەك هەنگاویش هەڵبێنێتەوە. تەنانەت پاروە نانێکیشی نەخوارد. بە پێچەوانە تا دەیتوانی ئاوی چوکوراوای دەخواردەوە، کە وەك خوێن و ڕەمڵ وابوو.

ببووه پارچەیەك ئێسك و پێست. هاوڕێکانی بە نۆرە، لەکۆڵیان دەکردو لەگەڵ خۆیان دەبرد.

هۆسۆك لە هەموان زیاتری هەڵدەگرت، چونکە لە هەمووان بەخۆوەتر بوو.

وسوو دەیگوت:

- ئەمن بەجێبێڵن و بڕۆن. بوومەتە بار بەسەر ئێوە. لێم گەڕێن با وەك ئەو مردووانە لەژێر خاکی ئەو جادەیە دفن کرێم.

ئەوان هیچ گوێیان بە قسەکانی نەدا.

لەپێش هەمووانیدا هۆسۆك وەخەبەرهات. دەستەگەورەکانی کردنە مشت و چاوەکانی پێ هەڵگلۆفین. هەموو لەشی دەلەرزی. پاشان ئاشق عەلی وەخەبەرهات، دوای ئەویش حەمەد.. وسوو تا بەیانی بەخەبەربوو، بەردەوام نالاندبووی، ئێستاش بە ئارامی ناڵەی دەهات. ددانەکانی بەسەریەکدا ڕەق ببوون. حەمە چکۆلیش دەستی ڕاستی لەسەرباخەڵی دانابوو لەسەری نووستبوو،دەتگوت هەناسەی لێ بڕاوە ئارام و هێدی وەکو منداڵێك..

سەرتاپای لەشیان بە شەونمی بەیانی تەڕببوو. چوکوراوا وەخەبەرهاتبوو، کەڵەشێرەکانی گوندەکەی نزیکیان خوێندیان. پاشان سەروسەکوتی تراکتۆرەکان دەرکەوتن. دوایی دەنگەدەنگی خەڵك و دەنگەکانی دیکە ڕۆژیان کردەوە.

پاش کەمێك مژێکی نەرم هەستا. قەسەڵی کێڵگەکە تروسکانەوە. لەدووریڕا، لەپشت کێوی(گاور) تۆپەڵەنوورێك دەرکەوت. بێرەیان دەگوت خاکی(یورەیر). خاکی ئەو یورەیرە، وەکو لەشی ئافرەتێکی گەنج گەرم و نەرمە. ئەو خاکە بەردیشی لێ دەڕوێن. بەرهەمێکی دەدا، وەکو دەڵێن پلنگی لێ دەرناچێ. دەنکە تۆوێك، سی هەتا چل تۆوی دەدا. لە پایزدا کە قۆزاخەکان دەتەقن، سەرانسەری خاکی یورەیر یەکپارچە سپی دەچێ.

هۆسۆك نووکە پێپەکی گەیاندە حەمە چکۆل و گوتی:

- هەستە، تووتکە سەگ! هەتا نیوەڕۆ دەنوێ. ئێستا لەسەر ئێمە بۆتە کەکیك نۆغلۆو!

ئاشق عەلی گوتی:

- هۆسۆك هەموو ئاکارت باشن، بەلاّم بریا ئەوەشت نەبا.

هۆسۆك گوتی:

- بڕوانە ئاشق. دەبەرتمرم، بڕوانە چۆن نووستووە. پارەکەی لەگیرفانی ناوەو دەستیشی لەسەر داناوەو لەسەری نووستووە. ئێستا وەرەو تووڕە مەبە! وادەزانێ ئێمە هەموومان دزین.

ئاشق گوتی:

- هەموو ئاکارت باشن. هۆسۆك.. . کوڕەکە پارەی بەخۆیەوە نەدیوە.. . خۆ بەزۆری نییە.. . نەیدیوە.. .

حەمە چکۆل بە تووڕەییەوە لەخەو هەستا.

ئیدی بێزاربیوون. دەمێك بوو بڕیاریان دابوو بگەڕێنەوە، بەڵام حەمەد بەهیچ جۆرێك لێیان نەدەگەڕا. تا دەیانویست بەرەو گوندەکەیان بگەڕێنەوە، حەمەد لەدوورەوە گوندێکی دەدیت و دەیگوت: (ئێستا وەرن با سەرێکیش لەو دێیە بدەین، حەتمەن لەوێ کارێکی پەیدادەکەین.)

بە پاڕانەوە دەیبردنە گوندەکە. بەو شێوەیە لەوانەیە دە جارانیش، ئەوکاتەی دەیانویست بگەڕێنەوە بۆگوندەکەیان، حەمەد گێڕابنیەوە. ئەو ڕۆژە ئاخرین ڕۆژبوو، ئیتر گەڕانەوە نەبوو، کارنەبوو. بۆچی بەو حاڵە زارو پەرێشانەوە، لە چوکوراوا سەرگەردان بخولێنەوە.

حەمەدیش ئومێدی نەمابوو. ملی بەلاوە نابوو، گوتبووی: (هاوڕێیان با بڕۆین ئیدی هیچ کارێکمان لەدەست نایە. باوەگەڕێین.)

وسوو لەسەر عەرزی لێی تخێڵ ببوو. هۆسۆك ڕاستی کردەوەو لەکۆڵی کرد.

وسوو بە هەوڵێك کە لێی چاوەڕوان نەدەکرا، بە ناڵەوە گوتی:

- دامنێ خوارێ.. . ئیدی بێزاربووم، لەوەی بەکۆڵی خەڵکییەوە بگەڕێم. بوومەتەبار بەسەر ئێوە.

دامنێ خوارێ. بۆ خۆم دەڕۆم.. . دامنێ خوارێ.

دەست و لاقی ڕادەوەشاند. لێکدا لێکدا لاقەکانی لەڕانی هۆسۆکی دەدان.

- دامنێ خوارێ، دەنا دەمرم.

ئاشق عەلی گوتی:

- مەکە براله. تۆ تاقەتی ڕۆیشتنت نییە. مەکە.. . بڕوانە ئەوە خەریکین دەگەڕێینەوە گوندەکەمان.

وسوو گوێی نەدایە. هەروا دەست و پێی ڕادەوەشاندن. هۆسۆکیش تووڕەبوو، بەرەڵلای کردو وەڕێکەوت.

حەمەد قۆڵێکی گرت و ئاشق عەلیش قۆڵەکەی دیکەی گرت و بەدوای هۆسۆکدا وەڕێکەوتن. وسوو سەری شۆڕکردبۆوەو لەکاتی ڕۆیشتندا، لاقی تێك دەهاڵان و لێکدا لێکدا

هەڵدەنگوت. پاش ئەوەی ماوەیەك بەو جۆرە ڕۆیشتن، یەكسەر ئەژنۆكانی نووشتانەوە. ئەگەر بەریان دابا، بەسەر دەم و چاواندا دەكەوت. حەمەد دەستبەجێ ڕاستی كردەوەو لەكۆڵی كرد.

حەمە چكۆل گوتی:

- ئەگەر بشمكوژن جارێكی دیكە ناچمەوە لای كەكیك ئۆغڵووی. لەبرسان دەمرم و ناچم. ئەتۆ دەڵێی چی مام ئاشق عەلی.؟

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەگەر منیش سەڵت بام و ژن و منداڵم نەبا، هیچ گرینگ نەبوو، منیش ئەگەر لە جێگای تۆ بام نەدەچوومەوە لای.

حەمە چكۆل:

- كرێی خۆمی نەدەدامێ هیچ، داركاریشی دەكردم.

حەمەدگوتی:

- ئەمن ئێستا چۆن تەماشای ژنەكەم بكەم؟ چی بە منداڵەكانم بڵێم؟

ئاشق عەلی گوتی:

- چتە حەمەد؟ دووبارە دەتەوێت دەست پێبكەیتەوە.؟

هۆسۆك:

- ئەگەر ئێستا، هەر ئێستا كار هەبێ و بڵێن وەرە كاربكە، ئەوجاریش لێرە گیرنابم و دەڕۆمەوە.

ئیدی بەسە. خوا ئاگادارە یەك سەعاتیش گیرنابم. ئەگەر چوكوراوا بە دارو بەردو تراكتۆرەكانییەوە، ئەو تراكتۆرە نەفرەتیانەیەوە بمدەنێ، ئەو جاریش لێرە گیرنابم.

ئاشق و هۆسۆك بە تەنیشت یەكەوە دەڕۆیشتن. حەمەد لەژێر قورسایی وسوودا، دوولا هاتبۆوەو لەپێش ئەواندا دەڕۆیشت. وسوو ملی بەلایەكدا لاركردبۆوەو لە ناڵەناڵ كەوتبوو. ئاشق چوو بەسەر سەری وسوویدا نووشتایەوەو گوتی:

- هۆسۆك، وسوو حاڵی خراپە. ملی لاربۆتەوە.. . خوا دەزانێ كە.. . بریا گەیشتباوە ئاوایی و لەلای ژن و منداڵەكانی.. .

هۆسۆك گوتی:

- لێی هیوا بڕاوم، ئەقڵم نایبڕێ. ئاگاتەوە گوندی. دڵم نایە وسووی لە چوكوراوا بەجێ بێڵین و بڕۆین.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- زۆر دژوارە.

هۆسۆك:

- کاتێك ئێمە گەیشتینەوە گوندی، ژنەکەی دێتەلامان. منداڵەکانیشی دەورەمان دەدەن. ئەوکاتی ئەمن چیان پێبلێم.؟ دەلێن وسوو کوا.. . ؟ ئاخ خۆزگە نەمرێت.. . ئەگەر نەمرێت قوربانییەکی دەکەم.

ئێوارە داهاتبوو، گەیشتنە کێلگەیەك، کە هەمووی کرابووە پەمۆ. لەقەراغەکانیشی ئەمامە پەمۆیان چاندبوون، کە بەرەورۆژ ئاوا درێژببوونەوە.

حەمەد وسووی هێناخوارو لەسەر خاکە کێڵراوەکە، لەسەر پشت درێژی کرد. ئاشق عەلی کەوایەکەی داکەندو لەژێر وسووی ڕاخست و گوتی:

- لانی کەم بەستەزمانە، لەسەر عەرزی ڕەق وتەق و بێڕایەخ با نەمرێ. دەورەیان دا. وسوو هەندێ جار لینگی درێژدەکردن و هەڵدەلەرزی و پاشان خۆی خڕدەکردەوەو وڕێنەی دەکرد. چاوەکانی زەق ببوون.

حەمەد گوتی:

- ئاشق دووعایان بخوێنە، با بەبێ ئیمانی نەمرێ.

ئاشق دەستی کرد بە دووعا خوێندن.

ئەو شەوە ئاگرێکیان کردەوە بێ ئەوەی چاوان لێك نێن، تا بەیانی بە دیار وسووی دانیشتن. وسوو نەمرد. کەمێك حاڵی باشتر ببوو. هۆسۆك وسووی لەکۆڵ کردو گوتی:

- ئیشاڵڵا نامرێ. ئیشاڵڵا بەساغی دەگاتەوە ئاوایی.

ئەو ڕۆژە لای نیوەڕۆ وسوو حاڵی تێکچۆوە.

هۆسۆك گوتی:

- لە کۆڵێی ناهێنمە خوار. ئەگەر هەر دەشمرێ، با بەکۆڵێمەوە بمرێ. ئیدی هێندەمان نەماوە لەچوکوراوا بچینەدەر. ئەگەر بۆنی کێوەکانی بۆ بێت زیندوو دەبێتەوە. تازە لە کۆڵێی ناهێنمەخوار.

سەعاتە ڕێیەك لەلای ڕاستیانەوە لەنێو دارە نارەوەنەکاندا، دێیەك وەدەرکەوت.

حەمەد لە ئاشق نزیك کەوتەوەو قۆڵی گرت و گوتی:

- ئاشق، ئەتۆ گوێ لەقسەی ئەو شێت و پێتەی ڕامەگرە. وسوو بەکۆڵێیەوە دەمرێ. ئێمەش ناتوانین وسووی لەناوکێڵگەی پەمۆجارەکەدا بنێژین و بڕۆین. تۆ گوێ لەقسەی وی ڕامەگرە. وەرە بابچینە ئەو گوندەی.

ئاشق گوتی:

- نا.. نابێ، ئەگەر قەرارە هەر بمرێ، لێگەڕێ با بمرێ.. .

حەمەدگوتی:

- ئاشق ئێمە بۆچی هاتووینە چوکوراوا؟ بۆ ئەوەی کاربکەین. وسوو هەر دەمرێ. لانی کەم با لەنێو ئاوەدانییەکی بمرێ.

ئاشق گوتی:

- چ فەرقێکی هەیە لێرە بمرێ یان لە ئاوەدانی.؟

حەمەد گوتی:

- دێهاتییەکان جەنازەکەی هەڵدەگرن و لانی کەم لەگۆڕستانێك دەینێژن.

ئاشق عەلی گوتی:

- پێم وایە. ئێرە چوکوراوایە، ئەوانە خەڵکی کێوپارەی لە گۆڕستانەکانیاندا جێ ناکەنەوە.

حەمەد:

- ئاخر ئەوە چ ڕۆیشتنەوەیەکە. چۆن بەدەستی بەتاڵ بڕۆینەوە. چ بە خەڵکی بڵێین. بەژن و منداڵەکانمان بڵێین چی.؟

ئاشق عەلی گوتی:

- چیان پێ بڵێین؟خۆ داهاتەکەمان لە قووماریێ نەدۆڕاندووە. !

حەمەد گوتی:

- ئاشق، کاکە دەستت ماچ دەکەم. بەری پێیانت ماچ دەکەم. ئەو دێیە پڕ لە دارو درەختە. تا ئێستا دێیەکی ئاوات لە چوکوراوا دیتوە.؟ دڵم خەبەری داوە، وەرە با سەرێك لەوگوندەی بدەین. حەتمەن کارێکمان دەست دەکەوێت. ئەگەر لەو دێیە کارمان دەست نەکەوت، لەملم دە.

هۆسۆك گەڕایەوەو بەڕاوێژێکی تووندەوە گوتی:

- حەمەد ئەتۆ دووبارە چاوت بە دێی کەوتەوە.؟ خەریکی ئاشقی لە خشتەدەبەی.؟ تۆ بڕۆ. من نایەم. ئەوەی دەیچێژین هەمووی لەدەستی تۆیە.

حەمەد قۆڵی هۆسۆکی گرت و گوتی:

- بڕوانە براڵە. ئەو بەستەزمانەی لە کۆڵی تۆیە، هەر دەمرێ. لێگەڕێ هەر نەبێ، با لەنێو ئاوەدانی و لە گۆڕستان بینێژین. بڕوانە، تا ئێستا هیچ گوندێکی ئاوات لە چوکوراوا دیتوە.؟ پڕ لەدار و درەختە. حەتمەن کارمان دەست دەکەوێت. ئەگەر لێرە کارمان دەست نەکەوت لەملم بدەو خوێنم حەلاڵت بێ.

پاشان ڕووی لەئاشق کردو گوتی:

- ئاشق کاکە، تۆ گوێ لەقسەی ئەو شێت و شوورەی ڕامەگرە. لەو دێیەی کار پەیدادەبێت. بڕوانە چەندەی دارودرەخت لێیە. !

ئاشق عەلی گوتی:

- بڵێم چی حەمەد. ئاخ بڵێم چی. ئای بریا کارێکمان دەست کەوتبایە.

هۆسۆک گوتی:

- دووبارە نەرم بوویتەوە ئاشق. دەی خۆت و ئێمەش لەو چوکوراوایە ئاوارەو سەرگەردانبکە.

حەمەد گوتی:

- دەبەرتمرم هۆسۆك. ئەو دێیە پڕ لە دار و درەختە. لێرە حەتمەن کارێکمان دەست دەکەوێت.

هۆسۆك گوتی:

- ئەمن نایەم، ئێوە بڕۆن.

کاتێك ئەوان وەڕێکەوتن، حەمە چکۆل بەجێما.

حەمەد گەڕایەوەو بەسەریدا شیڕاند:

- زووکە، وەرە ئێرە.

دەنگی پڕ لە تووڕەیی بوو. کوڕەکە دەست بەجێ غاری دا و هات لە پێشی ڕاوەستا.

- ئەوا پێت دەڵێم، ئەو دێیە پڕ لە درەختە، لەو دێیەی کار پەیدادەبێت. ئەتۆ تائێستا لەو چوکوراوا وێرانەیدا، دێیەکی وات چاوپێکەوتووە؟ وسووش ئەوە دەمرێت. لانی کەم با لێرە بمرێت. . . .

دەنگی گڕبوو، کۆڵە گرووی دە نەوکیٚ ما. دەتگوت خەریکە پاش نەختێکی دیکە لە نێوەڕاستی ئەو دەشتەی دانیشێ و وسووی لەپێش خۆی درێژبکاو شین و شەپۆڕێ دەست پێبکا.

لەبەرخۆیەوە دەیبۆلاند:

- چما وسوو خەلکی دێی خۆمان نییە؟ بۆ لەگەڵ وی نان و نمەکمان نەکردووە. ئێستا دەبوو جەنازەی ئەومان لەو دێیەی، لەژێر ئەو دارەفێنکانە.. . ڕەنگە ئێرە مەلاشی لێبێت. لەو مەلایانەی، کە هەنگوینیان لەدەم دەبارێ و دەنگیان وەکو ئاوی سەرچاوەی(مریەم چیل) دڵ ئارام و فێنك دەکەنەوە.. .

خۆر بەقورسی خۆی هەڵدەکشا. دنیا گەرمتردەبوو، ئەوانیش لەگوندە پڕ لە دارو درەختەکە دووردەکەوتنەوە. حەمەد لاقی لەدوونەدەهاتن.

بەلاّم بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی هاوڕێکانی ڕازی بکا:

- بەستەزمان وسوو، چەند پیاوی چاك بوو. ئاخر چۆن لەو دەشتە کاکی بەکاکییەدا بمرێ و جەنازەکەی لەو خاکەی، کە دەڵێی خۆڵەمێشی تەندوورە بسووتێ ! ئەو زەردە گەرمایەی تەماشاکە، چۆن هەموو شوێنێکی ئاور تێبەر دەداو ئێسکی بنیادەم داخ دەکاو دەیسووتێنێ. حەیف نییە بۆ وسووی؟ .. .

هۆسۆك:

- ئەتۆ خەمی وسووت نەبێ، ئەمن بەزیندوویی یان بەمردوویی دەیگەیەنمەوە کوێستانە فێنك و پەنا سەرچاوە پڕ لە وردە بەردە سپی و داپۆشراو بە پنگە وەنەوشەیی و زەردەکان.

ئاشق عەلی گوتی:

- حەمەد. براڵە حەمەد بڕوانە ئێمە ئەو هەمووە لەو چوکوراوا گەرم و وێرانەیدا، گەڕاین و هیچ کارێکیشمان پەیدانەکرد.

حەمەدگوتی:

- بەلاّم ئەوگوندە پڕە لەدرەخت.. . .

ئاشق عەلی گوتی:

- باشە با پڕ لە درەختیش بێت.. .

- بڕوانە هۆسۆك، بڕوانە ئاشق عەلی، حەمەد ئەتۆش، ئەتۆش گوێت لێبێ وسوو.. .

لەنێوەڕاستی ڕێیە ڕاوەستان. کاتێك ئەوان ڕاوەستان حەمەد لەبیری چوو، کە دەیویست بڵێ چی. ماوەیەك لەفکرەوەچوو.

زەوییەکەی دەوروبەریان، تا نزیکی دەریای سپی زەرد دەچوو، لەدوورتری بە ڕەنگی شینی دووکەڵاوی و تەمومژ دەستی پێدەکرد.

حەمەد ملەدرێژەکەی بەرەو لای وسوو وەرگێڕاو گوتی:

- ئێستا گریمان ئێمە گەیشتینەوە گوندەکەمان، ژن و منداڵەکانمان و خەڵکی ئاوایی هەر لە بستوێرا، کە چاویان پێکەوتین بە پیرمانەوە دێن؟

هۆسۆك:

- دیارە ئەگەر دێن.

- چیان پێبڵێین.؟

- دەڵێین چوکوراوا کاول بووە.

- حەمەد بەگاڵتە پێکردنەوە پرسی:

- ڕاست ئەوەی بڵێین.؟

ئاشق عەلی بە هێمنی و بە گاڵتە پێکردنەوە گوتی:

- هەردەبێ وا بڵێین؟..

- چی بە ژن و منداڵەکانمان بڵێین.

- دەڵێین زەوی قەڵشیووەو چوکوراوای قووتداوە.

- ئەمن چ بڵێم؟..

هۆسۆك تووڕەبوو:

- ئاشکرایە دەبێ چی بڵێی!

بەرەو کێوەکان وەڕێکەوتن.

حەمەد لەدواوەڕا هەرای کرد:

- برۆ. برۆ بە جەهەننەم. با ئەوساڵ ژن و منداڵەکانت لەبەر خاتری تۆ بە برسێتی سەربنێنەوە.

لە نێوەڕاستی ڕێگا ڕاوەستابوو، قۆڵی فش کردبوون و بە هاوارکردنەوە دەیگوت:

- ئەتۆ، دەبیە هۆی ئەوەی وسوو بمرێ. تۆ دەبیە قاتیلی وسووی. لەوانەیە ئەو دێیە مەلایەکی لێ بێ نووشتەیەکی بۆ وسووی بنووسێ. لەوانەیە نووشتەیەکی وای بۆ بنووسێ، ئەو

بەستەزمانە ڕزگاری بێ. ڕەنگە ئەو دێیە کەسێکی لێ بێ دەرزی لێبداو، دەرزییێکی لێبدا. لەوانەیە کەسێك پەیدابێ و حەبێکی بداتێ. لەوانەیە هەر بگەینە ئەو دێیە وسوو چاك بێتەوە. بڕوانە ئەو دێیە چەندەی دار و درەخت لێن. لەوانەیە چالاوێکی لێ بێ ئاوی فێنکی تێدا بێ. ڕەنگە کانییەکی وای لێ بێ ئاوەکەی وەکو تەرزە وابێ. کێ دەڵێ وسوو لەو ئاوە تەرزەیەی بخواتەوە حاڵی باش نابێ.

تا ئەو زیاتری دەگوت، هۆسۆك تووڕەتر دەبوو. وسووی بە کۆڵێ دادابوو بە جۆگەلە ئارەقی دەڕشت.

ئەوان کەمێك دوورکەوتبوونەوە، حەمەد لەناوەڕاستی ڕێگا بە تەنیا مابۆوە. بێ پسانەوە بۆڵەبۆڵی دەکردو هەندێ شتی دەگوت.

سێبەری هەورێکی گەورە بەسەر سەریدا تێپەڕی. دوای تێپەڕبوونی سێبەرەکە، خۆر بە تەواوی هەڵکشی بوو، بە شیدەتی هەرچی زیاترو بە قورسایی قوڕقوشم بەسەر دەشتەکەدا بلاوببۆوە.

وسوو کە بە کۆڵی هۆسۆکەوە بوو، چووکترین نوزەی لێ نەدەهات. دەتگوت خەوی لێکەوتووە، لاقەکانی وەکو مردووان شۆڕببوونەوەو بەسەرخۆڵەکەدا خشکەیان دەکرد.

تیشکی بە تینی خۆر لەقەسەڵی پەرێزەکەی دەداو تروسکەی چاویانی دەبرژاندەوە. وا چاویان ئەنگوابوون، کە نەیاندەتوانی سەرهەڵبێنن و دەوروبەری خۆیان ببینن. هەموویان شەلاڵی ئارەقە ببوون و لەتینوان وشك ببوون. لە کێڵگەکانی دەوروبەریان، لەکلەکە لاق درێژەکان لەسەرلاقە باریك و سوورەکانیان ملەدرێژەکانیان درێژتر کردبۆوەو بە لۆقەلۆق دەڕۆیشتن.

تراکتۆرێك کە خەرمان کوتێکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو بە توندی بەرەو ڕوویان دەهات. بەدوای تراکتۆرەکەشدا سی چل کرێکار، دەتگوت دەیانەوێ لە چۆمی وەپەڕن، لینگیان هەلکردبوو بە پێخواسی بە ناو بێدەنگیدا دەڕۆیشتن. ماندوو مجرۆ دەهاتنە بەرچاو. ئەوانیش لەکەناری جادە ڕاوەستان، چاوەڕوان بوون تا کرێکارەکان تێپەڕن.

حەمەد پێش ئەوەی وەڕێ بکەوێت گوتی:

- پڕ دارو فێنك.. . لەو دەوروبەرانە، لەو نزیکانە هیچ ئاوێك پەیدانابێ. ئەگەر هەروا برۆینە پێش، لەو بیابانەی لە تینوان دەمرین و ئەودندە گۆشتەی بە لەشیشمانەوە ماوە، هەلۆ خۆڵە مێشییەکان، دەیخۆن و ئێسکەکانیشمان لەنێوەڕاستی ئەو ئاگربارانەی بەجێ دێڵن.

هۆسۆك بە ئارامییەوە گوتی:

- لێیدەگەڕێن.

حەمەد کە لەو قسەیەی ئەو غیرەتی پەیداکردبوو گوتی:

- دێیەکە لێرەیە، بڕوانە چەندەی دار لێن.. . نابێ کاری لێ دەست نەکەوێت. تەماشاکە ئەو خەرمان کوتەش دەچێتەوە ئەوێ. بەڵکو دووعایەك.. . دەنا وسوو دەمرێ و لاشەکەشی بۆگەن دەکا.. . چما نەتدیت ئەو کرێکارانە کاتێك بە پێشماندا تێدەپەڕین، چۆن تەماشایان دەکردین. بە چاوە دەرپەڕیوەکانیانەوە، دەتگوت لەگیاندارێکی سەیرو عەجیب ڕادەمێنن.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەرێ بەڕاست بۆچی ئاوا تەماشایان دەکردین؟.. .

هۆسۆك گوتی:

- دیاربوو تەماشایان دەکردین.

حەمە چکۆل ماوەیەك بوو دەیویست شتێك بڵێ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی خۆی ئامادە بکا. لەناکاو قیروسیای لێکردو گوتی:

- ئەمن لەتینوان مردم. ئەو دێیەش پڕە لە دارو درەخت، بۆچی نەچین. بەڵکو لەوێ کارێکمان دەست کەوێت.

ئاشق عەلی گوتی:

- حەتمەن پەیدادبێ. چمادەکرێ لە چوکوراوا دێیەکی ئاوا پڕ لە داری لێ بێت و کارێکی لێ پەیدانەبێ؟ ئەمنیش لەتینوان خنکام.

حەمەد لەپێش ئاشقەوە دەڕۆیشت، گەڕایەوەو بە باوەڕپێنەکراویەوە تەماشای کرد.

ئاشق عەلی گوتی:

- لەتینوان خنکام حەمەد. هاچ بووە؟بۆ ئاوا چاوت تێوەبڕیوم.؟

هۆسۆکیش کە بەجێ مابوو گوتی:

- ماندووبووم.. . بەرەو لای پۆلە گوڵە هێرۆیەکەی پەناجادە ڕۆیشت. لاسکی گوڵە هێرۆیەکە بالاّ پیاوێك بەرزبوون، گوڵە پەمەییەکانی بە ئەندازەی لەپە دەستێك دەبوون، تەپوتۆزیان لەسەرنیشتبوو. وسوو لەنێوەڕاستی پۆلە گوڵە هێرۆیەکە، وەکو پارچە قوڕقوشمێك لەکۆڵی هۆسۆکی خزیەخوارێ و کەوت. ئەوانی دیکەش هاتن و لەپەنای ئەوان دانیشتن.

سێبەری پەڵەهەورێك لەحزەیەك بەسەریاندا كشا، ئەوان تاكەمێك لەشیان دەسڕییەوە، دووبارە خۆرە بەتینەكە، بەهەموو قورسایی خۆیەوە بەسەریاندا بلاَّودەبۆوە. لەهیچ لایەكرِا چووكترین پشووەبای نەدەهات. بەرەبەرە زەوییەكە وەكو ئاسن سووردەبۆوە. ئیدی لەوەبەدوا ڕۆیشتن زۆر دژوار بوو.

لەسەر یەكێك لەگوڵە پەمەییەكانی گوڵە هێرۆیەكە، پەپولەیەكی گەورەی شین بەبێ جووڵە نیشتبوو.

حەمەد سەری وەرگێڕاو لەدڵی خۆیدا گوتی:

- سەیرە! ئەو پەپولەیە لەنێو ئەو ئاگربارانە چ دەكا.. . لەو جێگایەی كە یەك دڵۆپە ئاوی لێ پەیدانابێ، چ دەكا.. .

نقوورچێكی لە ئاشق عەلی كوتاو گوتی:

- تەماشا ئەو پەپولەیەی بكە! لە نێو ئەو تەندوورە گەرمەی، ئەو شوێنەی كە هەموو شتێك ئاگری تێبەربووەو دەسوتێ.

ئاشق عەلی بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

- ئەی بابە. سەرم لێی دەرناچێ. زۆریش گەورەیە، بەقەدەر باڵندەیەكە.. . خوا دەزانێ لەكوێرا چ بایەك هێناویەتی و لێرەی فڕێداوە.

هۆسۆك:

- زۆرسەیرە. چلەی هاوین و پەپوولە، ئەویش هێندە گەورە، هیچ ناشجولێت. لەوانەیە مردبێت.

وسوو هاواری كرد:

- نەمردووە. ئەگەر باش تەماشای بكەن، باڵەكانی دەبریسكێنەوە. چۆن دەڵێن مردووە.

زیندووبوونەوەو هاواركرنی وسوو، ئەوەندەی سەریان لێی سوڕما، زیاتر خۆشحاڵی كردن.

- لێرە كەمێك ئەولاتر لای شاخەكانی ئاناوارزا، باتلاَّغێكی لێیە، كە هاوین و زستان پڕە لەو پەپوولانە.

حەمە چكۆل گوتی:

- ئەمنیش دیتوومن. بەسەرسەرمانەوە، وەكو پەڵە هەورێك تێدەپەڕین. زەردو شین و ڕەنگاو ڕەنگ بوون.

ئاشق عەلی:

- وەك پەڵەهەورێك، شین و ئەستێرە نیشان بوون. بە ترووسکانەوە، بەرەو شاخەکانی ئاناوارزا رادەخزین. شاخەکان شین دەبوون و ئەستێرەکانیشیان چاویان دەترووکاند. پەپولەی، نارنجی و سەوز و زێڕی.

هۆسۆك گوتی:

- ئەو پەپوولەیە مردووە.

ئەوانی دیکە بێدەنگ بوون. چاویان لە پەپوولەکەوە بڕیبوو، کە لەسەر گوڵە هێرۆیەکە نیشتبوو، پەپوولەکە لەگوڵەکە گەورەتربوو.

سێبەری چەند پەڵە هەورێك بەسەر سەریاندا تێپەڕی. ئەوانیش بەبێ چاوتروکاندن، لە پەپوولەکە ڕامابوون.

حەمە چکۆل نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێ، ئەوەی لەدڵیدابوو گوتی:

- ئیشاڵلاّ نەمردووە.

حەمەد هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

- ئیشاڵلاّ.

ئاشق عەلی:

- ئیشاڵلاّ.. .

هۆسۆك و وسووش گوتیان(ئیشاڵلاّ). هیچیان بیریان لەوەی نەدەکردەوە لێی نزیك ببنەوەو بزانن پەپوولەکە زیندووە یان مردوو. لەوانەشە بیریان لێ کردبێتەوە، بەڵام لەخۆیان ڕانەدیبێ.

کەمێك پێش، لەکاتێکدا سێبەرێکی فێنکی ئەوهەورە گەورەی کە بەسەریاندا کشابوو، ئۆتۆمبێلێك بەپێشیاندا تێپەڕی و خۆڵەکە بە تەوژم لەژێر تایەکانی بە دەوروبەری خۆیدا پرژاند. لاسکی گوڵە هێرۆیەکە، کە گوڵە پەمەیی دایپۆشیبوو جوولاّ. پەپوولە گەورەکەش، کە لەسەر گوڵەهێرۆیەکە نیشتبوو، جولاّ. بەڵام لە شوێنی خۆی نەبزووت.

حەمەچکۆل لەشوێنی خۆی هەستاو گوتی:

- نووستووە، ئەمن هەڵی دەستێنم.

بە پارێزەوە، هێدی هێدی بەرەو لای پەپوولەکە ڕۆیشت. گەیشتە لای پەپوولەکەو دەستی بۆ برد، کە لەناکاو بە دەنگی هاوارێك لە شوێنی خۆی ڕەق بوو. دەستەکەی هەروا لەهەوا ڕاگرتبوو، پەپوولەکە بە هاواری وسوو بە ئەندازەی بستێك هەڵفڕی و دووبارە، دەتگوت هیچ شتێك ڕووی نەداوە لەشوێنی خۆی نیشتەوە.

لەگەڵ هەڵفڕینی پەپوولەکە، هەموویان بەخۆشحاڵییەوە لەشوێنی خۆیان دەرپەڕین. وسوو بەپێکەنینەوە گوتی:

- فڕی.

ئەوانی دیکەش گوتیان:

- فڕی.

حەمەد:

ئەو دێیە پڕ لەدرەختە.. .

هۆسۆك:

- ئەو دێیە زۆر جوان و پڕ لە داروبارە. لێرە کارپەیدادەبێ.

هەموو لێکڕا گوتیان:

-پەیدادەبێ.

بەپەلە بەرەو ئاوایی وەڕێکەوتن.

حەمە چکۆل وەکو سەگێك لەپێشیانەوە دەڕۆیشت. گەڕایەوەو گوتی:

- ئەگەر کارم پەیداکرد، کرێیەکەم.. .

هۆسۆك تێی ڕاخوڕی:

- ملت بشکێنە، ملت بشکێنە.. .

حەمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

- تووڕەمەبە.. . بڕوانە وسووش زیندووبۆتەوە.

هۆسۆك گوتی:

- زۆر سەیرە. ئاخر چۆن بوو، ئەو پیاوە یەکسەر چاکبۆوە.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئێستا کەمێك سەبرکە، ئیشاڵلاّ وسوو چاك بۆتەوە.

حەمەد گوتی:

- ئیشاڵلاّ.

•

لەڕۆژئاوا، هەورەکان لەسەر دەریای سپی کۆببوونەوە، بە بەرزایی سپی دارێك بەچڕی بەرز دەبوونەوە. شنەبایەك هەڵی کردبوو، بۆنی سوێری دەریایان بەبەر لووتی داهات. تا

گوێزینگیان له خۆڵەکه ڕۆچووبوون، کاڵەکانیان پڕ له خۆڵ بوون. دەتگوت بەسەر پۆلواندا دەڕۆن.

نیوەڕۆ لایدابوو، که گەیشتنه دێیەکه. برسی و ماندووبوون. لەنێوەڕاستی گوندەکه لکی سێ بنه دارتوو، مەیدانێکی گەورەیان داپۆشیبوو، لەپەنا قەدی دارتوویێك تروومپایەکی سووری لێبوو، کەدی چوارگۆشەیی بەردیان لێ ڕیز کردبوون. سەرانسەری ژێر دارتووەکەیان ناوڕشێن کردبوو، کورسی و نیوتەختیان لێ دانابوون. هەر چوار دەوری تروومپایەکە، ڕەمەندە بەردبوو، دەوران دەوری گوڵ و ڕیحانەو گوڵه بارووديیان لێ چاندبوون. چڵه گوڵێکی سووریش گەڵاو لکەکانی خۆی بەولاولای خۆیدا بڵاوکردبۆوە، بۆنی گوڵه پەمەییه گەورەکان هەوای ئەوناوەیان داگرتبوو.

کاتێك گەیشتنه بن دارەکان، هەناسەیان سواربببوو. حەمەد دەست بەجێ دەسکی تووەمپایەکەی گرت و دەستی کرد بەترووەمپالێدان، هەرکه ئاوەکه هەڵڕژا، بانگی وسووی کرد:

- وسوو وەرە.

وسوو هات.

- سەرت وەبەر تروومپایەکه بنێ.

- جارێ ڕاوەسته، یەك دوو مستان وەخۆم.

حەمەد گوتی:

- نا، ئەوەیان نابێ. پێش کەمێك حەسانەوە ئاوخواردنەوە باش نییه. سەرت وەبەر تروومپایەکه بگرە.

وسوو مله درێژەکەی وەبەر تروومپا نا. ئەو ئاوەی که له تروومپاکه هەڵدەڕژا، دەتگوت ئاوی ئەو کانیانەیه که له پلووسکه دارەکان هەڵدەڕژێ. قوولپ قوولپ بەسەریدا دەکرد. له ناکاو وسوو دەروونی پڕ بوو لەشادی و بۆ ماوەیەك نەخۆشییەکەی لەبیرچۆوە.

لەدوای وسوو هۆسۆك چوو، دوای ئەویش ئاشق عەلی، ئەوجار حەمه چکۆل، سەریان وەبەر ئاوەکه نا، که به تەوژم لەتروومپاکه هەڵدەڕژا. لەدواییدا ئاشق عەلی تروومپاکەی لێداو حەمەدیش سەری وەبەر ئاوەکه نا. پاشان لوێچیان وەبەر ئاوەکه ناو بەئیشتیاوە هەتا زگیان هەڵمسا، ئاویان خواردەوە.

کاتێك لەسەر سەکۆی پەنا چاڵەکەی تەنیشتیان دانیشتن و لەدەوروبەری خۆیان ڕووانی، تازه چاویان بەو چوار پیاوە کەوتبوو، که لەسەر نیوتەختەکان پاڵیان دابۆوەو دانیشتبوون.

پیرەمێردەکان لەحاڵێکدا ڕیشیان بەسەر سینگیاندا پەرش وبلاّوببۆوە، جارجار ئەو مێشانەیان دەردەکرد، کە لەسەر دەم و چاویان دەنیشتن و وەنەوزیان دەدا.

لەولای تر پێنج شەش منداڵ لەنێو ئەو خاك و خۆڵە، بە هەراو هەنگامەو قیژەو قیژەوە یاریان دەکرد. دەرگای هەموو خانووە خشتەکانی بەرامبەریان داخرابوون. لە حەوشەی ماڵەکان لەژێر سێبەری تراکتۆرە مۆدیل جۆراوجۆرەکاندا، گەورەو بچووك، مریشکەکان بە قرتەقرتەوە جووجکە خەپەتۆڵەکانیان وەدوای خۆیان دابوو.

وسوو چاوی بە عەلیشیشێکی گەورە کەوت، کە پەڕەکانی گیف کردبوونەوەو دەگەڕا.

کاتێك ڕۆژبا هەڵی کردو هەورە تێکچڕژاوەکانی سەر دەریای سپی بەرەو سەرو هەڵکشان، ئەوان هەروا بە بێدەنگی لە پەنای یەکتر دانیشتن.

تراکتۆرو دەراسەو گەلاّبەو گالیسکەکان، بەنێوە ڕاستی گوندیدا تێدەپەڕین. جگە لەوانە هیچ مرۆڤ و چوارپێیەك لەنێو دێیدا نەدەبینران. دەتگوت هەمووشتێك لە خەودایە. کاتێك ڕۆژبا هەڵیکرد، ولاّت فێنك داهات. چەند ژنێك بۆ ئاوهێنان سەتڵەیان تاودایەو هاتنە سەر تروومپاکە، بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن سەتڵەکانیان پڕ لە ئاو کردو گەڕانەوە ماڵەکانیان. دووکەس لەپیرە پیاوەکان لە دوو لاوە ماوەیەك کۆخین. لە حەوشەی ماڵەکان سەلکە گوڵەبەڕۆژەی گەورە، گوڵەکانیان لێك کردبوونەوەو سەریان بەرەو خۆر هەڵبڕیبوو، خۆر بۆ هەر لایەك چووبا ئەوانیش لەگەڵی دەسووڕان. هەریەك لە سەلکە گوڵەبەڕۆژەکان بە ئەندازەی دەفرێك دەبوون.

ڕاست لەو کاتەیدا وسوو بەناڵە ناڵەوە گوتی:

- خەریکە دەمرم. ئەمن خەریکە دەمرم. ڕەق بوومەوە.

لەسەر سەکۆیەکە خۆی هاویشتە خوارێ و لەنێو خۆڵ و قوڕەکە دەستی کرد بەتلانەوە.

-سەرمامە، ئەوە ڕەق دەبمەوە، خەریکە دەمرم. گۆشتی لەشم خەریکە دادەڕزێ.

هۆسۆك چوو لەسەر سەری ڕاوەستا. دەستی لێك گرێدابوون و بەهەموو هێزی خۆیەوە بەخۆیەوە دەگوشین: گوتی:

- ئەو کارانە مەکە وسوو، ئەتۆ ئەورۆ حاڵت زۆر باشتر ببوو، دیتت چەندە خۆشحاڵ بووین. ئاوا ئازارمان مەدە، هێندە ناڕەحەتمان مەکە.. . . هاوارە لە من، هاوارە لە ئێمە.. . .

چاوی ترووکاندو تەماشای دەوروبەری خۆی کرد. دەتگوت بەدوای کەسێکدا دەگەڕێ قسەکانی بۆ بسەلمێنێ.

- وەرە وسوو، سەرت وەبەر تروومپایەکە بگرە، بەڵکو هێوربییەوە. وەرە.

هۆسۆك تووڕەبوو:

-دە بمرە، بەجەهەننەم دەمری. ناپیاوی شێت. باشە بۆچی بەو حاڵەوە هەستای هاتیە چوکوراواو بوویە بەلاّی گیانی ئێمە!بمرە، بمرە، بمرە.. . . بمرەو برۆ جەهەننەمیّ.. . لەویّ ئیدی قەت سەرمات نابیّ.

- سەرمامە، ئەوە دەمرم.. . ئاگرم تێبەربوو.. . .

هۆسۆك بە تووڕەییەوە چوو دەستی کرد بە تروومپالێدان. تروومپاکە بە ڕێژەو ئاوی لیّ هەڵدەڕژا و لەخواریّ دەچووە ناو بادییە بەردەکەوە. ماوەیەك ئاوا وەك شێتان تروومپای لێدا. هەناسەی سواربوو، پاشان هات و بەحاڵەتێکی تووڕەییەوە پشتی لە وسووی کردو بەرامبەر بە حەمەدی دانیشت.

پیرەپیاوەکان بە قورسی لەسەر نیوتەختەکانان هەستانە سەرپیّ و هاتن لەسەر سەری وسوو ڕاوەستان. بەسەرسووڕماویەوە تەماشای ئەو پیاوەیان دەکرد، کە لەسەر زەوی دەست و پێی ڕادەوەشاندن.

- نۆبەتێیەتی. ڕاست حەوت ساڵان ئەمنیش ئاوا هەڵلەرزیم و سووتام. تا ئاخرەکەی (مستەفا گۆدە) هات و چاکی کردمەوە. مستەفا گۆدە ئەفەندی بۆ نۆبەتیّ هەم شەربەتی دەداو هەم دووعاشی دەخوێند. هەم دەرمانەکانی باش بوون، هەم دووعاکانی. کاتێکیش دەیزانی نە دەرمانەکانی سوودیان هەیەو نە دووعاکانی، دەیان بردنە ئەویّ.. .

پیرەمێردەکە یەك دەندە قسەی دەکرد. لەقسەکانیڕا بۆت دەرنەدەکەوت کە( ئەویّ ) کوێیە. بەلاّم هەر دەیگوت ئەگەر ئەو پیاوەی نەگەیەننە(ئەویّ) دەمرێت.

- ئەو پیاوە دەمرێت. !

هۆسۆك گوێی هەڵخست بوو، بە وردی گوێی لەقسەکانی ڕاگرتبوو.

لەو ماوەیەدا ژن و پیاوو منداڵ دەوروبەری نەخۆشەکەیان پڕکرد. گوتیان:

- وەی، وەی. بۆخەڵکی کوێستانیّ کە هیچ بەرگەی نۆبەتێیان ناگرن. لێرە ئێمە لەحەوت ساڵەی ڕا هەتا حەفتا ساڵەمان، بە نۆبەتێیان مردین و زیندووبووینەوەو نەشمان گوت وەی.. . ئەوانەش لەگەڵ یەك(تا) ڕووحیان دەردەچیّ.

- ئەو کوێستانیانە ئەوەندە ناسکن.. . بەستەزمانانە چ بکەن.. .

ژنێکی گەنج کە کەزییەکانی هۆندبوونەوەو بە دەسماڵەکەیڕا دیاربوو تازەبووکە، گوتی:

- کاریش دەست ناکەوێ.

- دوو سێ ساڵە ئەو بەستەزمانانە لەکوێستانێرا دەڕژێنە ئێرە، هەم ناوا نۆبەتێیان دێتێ و لە مەرگ دەگەڕێنەوە، هەم کاریشیان دەست ناکەوێ و بەبرسێتی دەمێننەوە.

ژنێك بەقاپە ناوێك و سێ حەبی دژی نۆبەتێ لەوێ قووت بۆوە.

- ها ئەوانە قووتبدە، دەنا هەتا بەیانی دەمری. ئەتۆ نۆبەتێیەکە لێی پیس کردووی، زەحمەتە چاك ببیەوە.

پیرەژنێك گوتی:

- بەستەزمانە، باشتر وایە هاورێکانت بتبەنە(ئەوێ).

هۆسۆك لەپیرەژنەکە نزیك کەوتەوەو گوتی:

- بۆ کوێ؟

ژنە سەیرێکی سەرتاپای هۆسۆکی کردو گوتی:

- ئەتۆ برادەری ئەوی؟

- لەوەتەی هاتووینە چوکوراوا، بەکۆڵێ هەڵم گرتووە، خەریکە دەمرێ.

ژنە قۆڵی گرت و جیای کردەوەو بەگوێیدا چرپاند:

- (ئەوێ)! ئێمە پێشتر هەرکەسێکمان نۆبەتێی هاتبایە دەمانبردە(ئەوێ).

- بۆ کوێ؟

- ڕاوەستە، پەلەی مەکە. (ئەوێ).. . لەژێر ئەوێ کانییەك هەڵدەقوڵێ ڕاوەستە، پەلەی مەکە.

کیژۆڵەیەك لە پەنایان قووت بۆوەو گوتی:

- لای دارهەناری سەرگردەکە. !

ژنە دەربەری و پەلاماری کچەی دا، دەستی کرد بە تووك لێکردنی:

-ڕەببی زەلیل بی. یاخوا ڕاست نەبیەوە. بنیادەم  بە وەخت و بێوەخت ئەویش بەدەنگی بلند، باسی دارهەنارەکەی دەکا؟ کن دارهەنارەکە شوێنی چل سوارەی غەیبییە. ئەتۆش بەیانی پێش تاوهەلات، کاتێك ئەستێرەی گەلاوێژ ئەنگوت، وەرنە لای من هەتا پێتان بلێم (ئەوێ) کوێیە. کاتێك گەیشتنە ئەوێ، خوای گەورە لەبەر خۆشەویستی چل سوارەی غەیبی هەم لە گرانەتا دەتان پارێزێ و هەم بە ئێوەش.. .

ماڵەکەی بە هۆسۆك نیشان داو بە هێواشی پێیگوت کە چ کاتێك بێت و دوورکەوتەوە.
پاش کەمێك بە کەولێکی پڕ لەنان و قابلەمەیەك پلاوبرویێشی چەورەوەو دیزە دۆیەك گەڕایەوە:

- چوکوراوایی کافربوون، ئینسانیەت نەماوە. ئەگەرچی لەپێشانیشدا هەر لێی نەبوو، بەلام ئێستا هەر هیچی لێ نەماوە. ئەمنیش خەڵکی ئەو کوێستانانەم براینە.

وەرسووڕاو دەستی بلندکردو ئەوبەری، ئەوسەری ئەوکێوە شینانەی بە حاستەم دیاربوون و کێوە گەورەو لووتکە بەرزەکەی (دووڵ دووڵ) ی نیشاندان، کە مژێکی سوور لەلووتکەکەی هەڵدەستا.

- خەڵکی ئەو کێوانەم. دەبەریان مرم. لە بناری ئەو کێوانە کە لە سوێیانیان ئەوە دەمرم. کانییەکانی پڕ لە ورده بەردی سپین وگوڵە پنگی زەردو وەنەوشەیی لێرِاون.. . فەرموون دانیشن و نانەکەتان بخۆن. کوڕینە خوا دەزانێ چەند ڕۆژە برسیتانە. ئاخ ئەگەر هەندێك بەفر هەبایەو لە دۆیەکەمان هاویشتبایە.. . ئەو نۆبەتێدارە بەستەزمانە.. .

کچە جحێڵەیەك کە ناوەڵ کراسێکی ڕەشی لەبەردابوو و دەسماڵێکی پوولەکەداری بەسەرەوەبوو گوتی:

- ئێمە بەفرمان هەیە، ئێستا دەچم بۆتان دێنم.

کچە لەچاوتروکانێکدا ڕۆیشت و لەدەفرێکی مسدا بە کلۆبەفرێکەوە گەڕایەوە. کەوڵەکەیان ڕاخست و قابلەمەکەشیان لەنێوەڕاستێ دانا. نان و کەوچکەکانیان لەسەر دانا. دەفرەکانیان پڕکرد لە دۆ و بەفرەکەیان وردکردو هەر دەفرەی پارچەیەکیان تێهاویشت.

دێهاتییەکان گوتیان:

- نۆشی گیانتان بێ. بێدەنگ بوون و دوورکەوتنەوە.

وسوو کەمێك تایەکەی دابەزیبوو، برادەرەکانی لەنێو تەپوتۆزەکە هەڵیان گرتەوەو جلکەکانیان تەکاندو دەم و چاویان شرد. پاشان هێنایانە پەنا سفرەکەو کەوچکێکیان وەدەستی دا. وسوو پێش ئەوەی دەست بۆ قابلەمە پلاو بروێشەکە بەرێ، تاویدایە دەفرە دۆیەکە، کەکلۆ بەفرەکە لەناویدا مەلەی دەکرد. هەڵیگرت بینی پێوەناو چۆڕی لێبڕی.

لەپێش چاوی دێهاتییەکان نانەکەیان خواردو خەلاسیان کردو لێکرا گوتیان: (خوا بەزیادی کا) دەم و دەستیان بە ناوی ترووم‌پایەکە شرد.

ژمارەی دێهاتییەکان لەبن دارتووەکە زۆرتردەبوون. ڕۆژبایەکە تەپوتۆزی نێو دێی بە هەوادا بلاودەکردەوە. هەموو پێش دەرگاو سەربان و دیوارو پەنجەرەو دەرگاکان، بە تەپوتۆز سواخ

درابوون. گەڵای دارتووەکان و گیشەگیاو دڕوەڵێن و هەنجیرە فەرەنگییەکان و هەموو شتێك بستێك تەپوتۆزو چرپ و چاڵیان لەسەرکەوتبوو.

دێهاتییەکان بەبێ دەنگی و بەشێوەیەکی سەیر تەماشای ئەو پیاوانەیان دەکرد، کەلەسەر سەکۆی پەنا چاڵەکە دانیشتبوون.

حەمەد لەناکاو لەجێی خۆی هەستاو چاوی بەسەر حەشیمەتەکەدا گێڕا، پاشان سەری بەردایەوە:

- ئێمە بەو ئومێدەوە هاتووینە ئەو دێیە، بەڵکو لەلای ئێوە کارێکمان دەستکەوێ.. . .
ئاخر ئەو گوندە پڕ لەدرەختە.. . ئاوی تروومپاکەشتان زۆر سازگارە.

سەری هەڵبڕی دووبارە چاوی بەسەر حەشیمەتەکەدا گێڕا. هیچ کەسێك ورتەی لەبەرنەهات.

حەمەد چاوی تێوەبڕیبوون و بەدوای تیشکی هیوایەکدا دەگەڕاو چاوەڕوان بوو. دێهاتییەکان بەرەبەرە بلاوەیان لێکرد. کاتێك چۆڵ بوو، حەمەد لەسەر سەکۆیەکە خۆی بەجێهێشت.

- ئەو هەموو درەختە، ئەو هەموو خەڵك و ئەو هەموو کێڵگەیە.. . .

تا خۆرئاوابوو لەسەر سەکۆیەکە دەستەوئەژنۆ لێی دانیشت. تەپۆ وەکو هەور دەهاتن و وەکو گورگی برسی هێرشیان دێنا.

هۆسۆك گوتی:

- ئێرە بەکەڵك نایە، لەبن ئەو دارانە ناتوانین بنووین. دەبێ جێگایەك بۆ نووستن و ئاگرکردنەوە وەبینین.

حەمەد:

- ئاشق، گۆرانییەکی بڵێ.. . تا بەیانی بڵێ و سازلێدە.. .

دێهاتییەکان لەسەربان و لەسەر کەپرەکانیان، پەردە کوللەیان هەڵدابوو، ڕۆژبا هەڵی کردبوو، لەژێر تریفەی مانگەشەودا، پەردە کوللەکان بە ئارامی ڕادەژان.

ئاشق عەلی بە ڕاوێژێکی تێکەڵ بە ناڵینەوە گوتی:

- ئێستا چ کاتی گۆرانی گوتنە.؟

حەمەد گوتی:

- بۆ وەختی نییە، بەڵکو.. .

- بەڵکو و مەڵکوی پێناوێ. لێرە، لەو گوندەی کاردەست ناکەوێ. یاڵڵا با هەستین.. .

- ئەو ژنەی خەڵکی کوێستانەکانی لای ئێمەیە، ئەوەی چێشتی بۆ هێناین.. . قابلەمەو کەوڵەکەی هەر لێرەن. با لێرەبین؟.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- چۆن دەتوانین لێرە بنووین.؟

حەمەد:

- ئاخر بەڵکو.. .

هۆسۆک:

- بەڵکو...

وسوو:

- تاریك و ڕوونی بەیانی دێینەوە نێو ئاوایی و لێرە دادەنیشین. بەڵکو.. .

هەستانەسەرپێ، کەوڵ و قابلەمەو کەوچکەکانیان کۆکردنەوەو لە دێی وەدەرکەوتن. گەیشتنە سەر تەپۆلکەیەك، کە لەژێر تریفەی مانگەشەودا قووت ببۆوە. دەستبەجێ چرپ و چاڵیان کۆکردەوەو بە بەردئەستێ دایانگیرساند. هەر لەگەڵ هەڵبوونی ئاگرەکە، وزەوزی تەپۆیان کەمبوونەوە.

- ئەمن بوومە بەڵای گیانی ئێوە براینە. خۆزگە بەیانی نەخۆش نەبم. کاك هۆسۆك ئەوەندەی بە کۆڵێ گێڕام، نیوەمردوو بوو.

هۆسۆك گوتی:

- هۆسۆك بەیانی بەرەو کوێستان مل دەنێ، بەیانی زوو، کە سیوادی دا.. . ئێوە ئەگەر پێتان خۆشە هەر لێرە بمێننەوە. بڕوانن لەوبەری منارەی مزگەوتێك دیارە، ڕەنگە ئەوێ کاری لێ پەیدابێ.

حەمە چکۆل گوتی:

- ئەوێ کاری لێ دەست دەکەوێت. هەر گوندێك مزگەوت و منارەی لێبێ، هەمیشەکاری لێ پەیدادەبێ. دەنا چۆن لەگوندەکەیان منارە دروست دەکەن؟

حەمەد پێکەنی:

- کوڕەکە ڕاست دەکا. دەنا بۆچی بە خۆڕایی منارەی لێ دروست دەکەن، ئەویش منارەیەکی سپی بەو بڵندیەی.. .

حەمە چكۆل گوتی:

- بەو بڵندییەی.. . . سەری گەیاندۆتە کەشکەلانی ئاسمانێ. بە شەوێش دەبریسکێتەوە.

- ئەگەر هەموو چوکوراواشم بدەنێ.. . . بەیانی کە سیوادی دا.. . .

وسوو:

- بەیانی کە سیوادی دا ئەمنیش لەگەڵ هۆسۆکی دەڕۆم.. . . ئای خۆزگە بەیانی نەخۆش نەبم.. .

هەرکە ئاگرەکە دادەمرکاو دووکەڵەکەی کەم دەبوو، تەپۆ وەکو ڕەوە گورگ هێرشیان دێنا.. .

ئاشق عەلی گوتی:

- بەو حاڵەی هەموومان تووشی وەزعی وسووی دەبین. بۆ سبەینێ شەوێ دەبێ خۆمان بگەیەنینە بناری شاخەکان.

- ئاشق عەلی.. .

- فەرموو کاك حەمەد.. .

- ئاشق عەلی.. . هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە؟.. . .

ئاشق عەلی بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- نا.. .

پاشان سازەکەی تاودایەو بەسەریدا کۆمبۆوەو تێیهەڵکرد. ئاوازی سەرچاوە پڕ لە سوونبوولە شین و پڕ لە وردە بەردی سپی و داپۆشراو بە گوڵەپنگی تێڕا هەڵدا.. . لە خەفەت و زۆرداری دوا.. . لەو تەپۆیانەی وەکو گورگی برسی و هارن.. . دەیگوت: (ئەو خودایەی یوسفی لەبیر نەجاتدا، لووتفی ئێمە ناگرێتەوەو ڕووی لێوەرگێڕاوین. ) دەیگوت: (ئێسقانەکانمان لە چوکوراوا بەجێ دەمێنن، هەتا کەسێکیش نابێ لە سەرەمەرگدا شیوەنمان لەسەربکا. لاشەکەشمان وەکوو کەلاکە سەگێك لە قولکەیەکی داوێن. ) دەیگوت: (گوڵزاری ئێمە خەزان لێیداو تەمەنمان کۆتایی هات. ) دەیگوت: (دارهەناری سەرگردەکە لەوێیە، کە لە زۆر کۆنەوە هەتا ئێستاش هەر ماوە. شیفای دەردەداران دەداو کار بۆ بێکاران پەیدادەکات. ) دەیگوت: (لەبن دارهەنارەکە گوڵی سووری لێن، کانییەك هەڵدەقوڵێ ئاوەکەی دەڵێی نوورە. )

ئاشق عەلی تا زەردە لەسەرانیدا، گۆرانی نەبیستراوو داستانی لەبارەی وەسفی دارهەنارەکەوە گوتن. حەمەد پرسی:

- ئاشق تۆ ئەو دارهەنارەت دیتووە.؟

- نا، نەمدیتووە.

- هیچت دەربارەی بیستووە.؟

- نەمبیستووە، ئەو دێهاتیانە باسیان کرد، چما ئەو ژنەی چێشتی بۆ هێنایین باسی نەکرد.؟

- ئەتۆ، ئەو ئاوازەت لەکوێرا هێنان.؟

- ئەمن نەمهێناون خودا هێناونی.

- ئەگەر ئەو دارهەنارەی وەبینین، هەم وسوو چاك دەبێتەوەو هەم کاریشمان دەست دەکەوێت.

هۆسۆك توورەبوو گووتی:

- ئەمن بەدوای دارهەنارو ئەو جۆرەشتانەدا ناچم، پاش ماوەیەکی دیکە ملی ڕێیەدەگرم ودەڕۆم.

ئاشق گوتی:

- هۆسۆك، ـەی مەکە.

دووبارە سازەکەی بەسنگیەوەناو بەسەریدا نووشتایەوەو گۆرانییەکی دیکەی بۆ دارهەنارەکە دروست کرد.

وسوو:

- خەڵکی چوکوراوا هەموویان ئاگاداری ئەو دارهەنارەن. ئەو نەخۆشییە حەوت ساڵە لە لەشمدا ڕیشەی داکوتاوە. بەشکم ئەگەر بگەینە کن ئەو دارهەنارە، خودا شیفام بدات.

حەمەد بەباوەڕو دڵنیاییەوە گووتی:

- دارەکان مووجیزەی زۆریان هەیە.

حەمە چکۆل گوتی:

- باپیرم دەیگووت کە درەختەکان. . . داری واهەن، کە نەزەرکردەن. . ڕەنگە هەقەکەی منیش بدەن.

وسوو:

- ئەو دارە مووجیزەدارە، هیچ تەپۆیەك لەدەوروبەری نزیك نابێتەوە. شەوێکی لەویَ لەژێر ئەو دارە دەنووین.

هۆسۆك بە توورەییەوە نەڕاندی:

- ئێوە بڕۆن. ئاخر چما دەکرێ چووکوراوا تەپۆی لێنەبێ.؟ دارهەنارێکی بێچارە لەبەرامبەر تەپۆیان چی لەدەست دێت.؟ ئەویش تەپۆی ئێسکداری چووکوراوا.

حەمەد بەشلەژاوییەوە گوتی:

- تۆبەی بکە هۆسۆك. بلێ تۆبە. هیچ بەو دارەی مەلێ دەنا دەست و پێت ڕەق دەبن. ئێمە کە ماڵ وێران بووین و هەموو شتێکمان لەدەست داوە، ئەتۆش مەبە بەلای گیانی ئێمە؟.. . هەتا حەوت پشتان وسوومان بەسە. ئامان هۆسۆك، بۆ خاتری خوای.. . ئامان.. .

ئاشق عەلیش گوتی:

- ئامان هۆسۆك ئامان. ئێوە نابێ کارتان بەکاری نەزەرکردەکانەوە هەبێ. ئەویش داری چاکی و نەزەرکردە.

هەستایە سەرپێ و وەڕێکەوت و گوتی:

- دەرمانی ڕێیە ڕۆیشتنە.. . ئێستا با وەڕێکەوین، سەرێکیش لەو گوندەبدەین. بەڵکوو ئەوەخوایە.. .

بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن وەدوای کەوتن. لەڕێگا شنەبایەك لێیدان و هاتنەوە سەرخۆ. شادی و هیوایەکی شاردراوە لەدەروونیان دەگەڕا. هۆسۆك لەدوای هەموانەوە دەڕۆیشت.

گەیشتنە سەر چاڵەکەو لەبن دارەکان دانیشتن. لەناکاو دەنگ و هەرا لەنێو ئاوایی گەڕا، دێ لەگەڵ، ئەسپ و گاو کەرو تراکتۆرو داشقەو دەراسەو کرێکارەکان وەخەبەرهاتبوو. دەنگەکان تێکەڵ ببوون. کەڵەشێرەکان دەیانخوێندو سەگەل دەوەڕین. لەجێگایەکیش دەنگی بانگێکی خەمناك و دڵگیر بەرزببووەوە. ماوەیەك لەبن دارتووەکان و لەسەر چاڵاوەکە چاوەڕێ مان.

حەمەد گوتی:

- ئەو ژنە مێهرەبانە، ئەوەی خەڵکی چیای (دووڵ دووڵ)بوو.. . ئەو دەزانێ.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەو دەزانێ.

حەمە چکۆل گوتی:

- حەتمەن دەزانێ. !

وسوو گوتی:

- له چوکوراوا هەموو دەزانن، کە(ئەویٚ) لەکوێیە.؟

تراکتۆرو گەلاّبەی پڕ له دێهاتی لەدێی وەدەردەکەوتن. پاش ماوەیەکی کەم، دووبارە بێدەنگی باڵی بەسەر گونددا کێشا. پیرەمێردەکانی دوێنیٚ، دووبارە هاتنەوەو لەجێگاکەی خۆیان دانیشتنەوەو چەناگەیان وەسەردار دەستیەکانیان کرد. چەند ژنێك هاتن و لەچاڵاوەکە ئاویان هەڵێنجاو ڕۆیشتنەوە.

- ماڵی ئەو ژنە لەکوێیە.؟

حەمەد گوتی:

- ئێستا دێت.

وسوو بەبیٚ سەبرییەوە گوتی:

- لەماڵیٚ چاوەڕوانمانە. حەتمەن شتێك دەزانیٚ، بۆیە پێی خۆش بوو بچینە ماڵی.

هۆسۆکیش وەقسەهات و بەدەنگێکی بەرز گوتی:

- بێگومان شتێك دەزانیٚ.

- یاڵلاّ بابچین لەماڵەکەی بگەڕێین.

قابلەمەو کەوڵە نەخشینەکەیان بەدەستەوەگرت و وەنێو دێی کەوتن.

هۆسۆك گوتی:

- با لەکەسێك بپرسین، بڵێین ماڵی ئەوەی خەڵکی چیای دووڵ دووڵە لەکوێیە.؟

- ماڵی کیٚ؟ ماڵی کیٚ؟

- ئەو ژنەی کە خەڵکی چیای دووڵ دووڵە.

حەمە چکۆل گوتی:

- ئەو ژنە مێهرەبانە.

- هیچ کەسێکی وا لێرە نییە.؟

لەپشت ماڵەکان دووکەڵ هەڵدەستا. لە باخ و کێڵگەکان، مژێکی نەرم بەرزببووەوە. هێندەی نەمابوو، لووتکەی چیای (گاور) ڕووناك ببێتەوە. دیٚ بەتەواوی چۆڵ ببوو کەسی تێدا نەدەبینرا.

-بۆچی ماڵی ئەو ژنەمان لەو پیرەمێردانە نەپرسی.؟

هۆسۆك گوتی:

-ئەوانە چووزانن. بە چی بزانن. هەریەکەیان تەمەنی سەد ساڵ دەبیٚ.

لەناکاو چاویان بە ژنەکە کەوت کە ڕووبەڕوویان دەهات، ڕاوەستان.
ژنەگوتی:
-فەرموون کوڕینە. چام بۆ لێناون و ڕۆنەکەرەش حازرە و نان ساجیشم بۆ دروست کردوون. ئێستا فەرموون لەگەڵم وەرن.
بەدوایدا ڕۆیشتن و چوونە خانووێیەکی قوڕەوە. لەهەیوانێ لەسەر گیا، سفرەیەکی جاجم ڕاخرابوو، کیژۆڵەیەکی چواردە ساڵە چاوەڕوانیان بوو. بە هێمنی لەدەوری سفرە کۆبوونەوەو دانیشتن. ژنە چای بۆ لە ئیستیکانی نێوقەد باریك کردن. ئەوانیش بەبێ دەنگی خواردیانەوە. تەنیا دەنگی مڵچەمڵچیان دەبیسترا. خێرا بەرچاییەکەیان خوارد.
حەمەد دوای ئەوەی بە پشتەدەست دەمولێوی سڕینەوە گوتی:
- هیچ کارێکمان دەست نەکەوت. لە چوکوراوا جێیەك نەما سەری پێدانەکەین. کارمان دەست نەکەوت خوشکێ. چوکوراوا چی بەسەرهاتووە.؟
- ژنەگوتی:
- نازانم چەند ساڵ دەبێ، چوکوراوا وەك خۆی نەماوە.
حەمەد گوتی:
-زۆر گۆڕاوە. ئەو ( ئاغا ژنەی من) ناناسی؟ هەتا تەماشاشی نەکردم. تەنانەت گا زەردیشمی کردە قوربانی تراکتۆرەکەی. خوێنە سوورەکەیان بەبن تایەکانی کرد. من بەو گازەردە سێ دانە ساڵی ڕەبەق زەویم کێلا. کاتێك بەجێم هێشت، بەستەزمانە دەگریا.
ژنە گوتی:
-گاجووتەکان دەگریەن.
هۆسۆك هەر پیشی دەخواردەوە لەناکاو تەقییەوە:
-لەکوێیە خوشکێ؟ لەکوێیە؟
ژنە پرسی:
-چی لەکوێیە؟
هۆسۆك گوتی:
-جێگای ئەو دارهەنارەمان پێنیشان بدە. بەڵکو دەرمانێکی دەردەکەمان بکات. پێشینان دەیانگوت: (دارموجیزەی زۆریان هەیە. )
ژنەگوتی:

- ئەدی هەیەتی. بەڵام ئەگەر دارەکە هەتا ئێستاش لەشوێنی خۆی مابێ.
حەمەد بەتووندی گوتی:
-ئەو دارانە هیچیان بەسەرنایە. ئەو دارانە هیچ کاتێك هیچیان بەسەرنایە. هیچ کەسێك ناتوانێ خۆی لەقەرەی ئەو دارانە بدات. تەنانەت باڵندەش لەبەر ڕێزی ئەو دارانە لەسەر لك و پۆپەکانیان هەڵنانیشن. تەپۆو مێشوولەش لێی ترێك نابنەوە. مێش هەنگوینەش لەسەر گوڵ و گەڵاکانیان وزەوز ناکەن. ئەگەر هەرکەسێك دەستیان بۆ بەرێ، دەست و پێی ڕەق دەبن. ئەگەرهەرکەسێك، تەنانەت گەڵایەکیشی لێوەکا، ماڵ وێران دەبێ.
ژنەگوتی:
- دەڵێن ئەو دارە تووڕەبووە، لەو ئینسانە زۆردارانە تووڕەبووە. دەڵێن تووڕەبووەو شەوێکی هەڵفڕیوەو ڕۆیشتووە.
دووبارە حەمەد بەتووندییەوە گوتی:
-ناتوانێ تووڕەبێ. خوا ئەو دارەی. . . .
لەبیری چوو دەیویست بڵێ چی. هەندێك منگەمنگی کردو سەرەنجام لەسەرخۆگوتی:
-ئەو دارە ناتوانێ تووڕەبێ. . ناتوانێ بچێتە هیچ کوێیەك. چونکە بنیادەم ئیحتیاجیان پێیەتی. ئەگەر ئەو دارە نەبێ نۆبەتێدارەکان چۆن دەتوانن نەجاتیان بێ؟ نەخۆشەکان چۆن چاك وەبن. بێکارەکان چۆن کار پەیدابکەن.؟
ژنە ملی لارکردەوەو گوتی:
-تووڕەبووە.
هۆسۆك بە هەژانەوە گوتی:
- ئەتۆ ئەو شوێنەمان نیشان بدە. ئێمە دەبێ ئەو دارەی زیارەت بکەین و حاڵ و وەزعی خۆمانی تێبگەیەنین. گریمان لە بنەوەڕا بڕیویانەتەوە گرنگ نییە. حاڵ و وەزعی خۆمان بەڕەگەکانی دەڵێین. گریمان ڕەگ وقەدو لقەکانیشیان لەبنەودڕا هەڵکەندوون، ئێمە حاڵ و وەزعی خۆمان بەخاکەکەی دەڵێین. هەر ئەوەندە بەسە گردەکەی وەبینین و شەوێك لەبن ئەودارهەنارەی بنووین.
- دارهەنارە پیرۆزەکە تووڕەبووبێ و ڕۆیشتبێتیش، چونکە دارێکی پیرۆزە ئەگەر ئێمە بگەینە ئەوێ و خاکەکەی ماچ بکەین، بۆ دەرمانی دەردی ئێمە دەگەڕێتەوە. کاتێکیش دەرمانی دەردی ئێمەی کرد دووبارە دەگەڕێتەوە جێی خۆی.

دیاره ئەگەر تووڕەبووبێ.

هۆسۆك گوتی:

- دێتەوە. ئەگەر تووڕەبووبێ و ڕۆیشتبێتیش دێتەوە.

حەمە چکۆل بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- دەگەڕێتەوە.

وسووش بەناڵینەوە گوتی:

- دەگەڕێتەوە.. . چما دەکرێ نەگەڕێتەوە.

ئاشق عەلی گوتی:

-دەگەڕێتەوە. دەگەڕێتەوە. داری پیرۆزو پیاوچاکان هەمیشە میهرەبانن.

ژنەگوتی:

-میهرەبانن.

-شوێنەکەیان پێشان دە خوشکێ.

-توخوا، پێمان بڵێ خوشکێ.

- ئەگەر جێگاکەیان پێ بڵێی یەکسەر دەچییە بەهەشتێ.

ژنە وەپێشیان کەوت و بردنییەدەری ئاوایی. ڕووی لەقەڵای ئاناوارزا کردو ئەو خوارانەی نیشاندان. تەواوی دەشتەکە سوتاوو گەرم و خۆڵەمێشی بوو، بە مژێکی چڕ داپۆشرابوو، ئەولای تەپۆلکەو باخچەکان، کە بەزەحمەت دەبینران.

لەوێوە لە بەستێنەکەی چۆمی جەیهان تێدەپەڕن دەگەنە جادەیەکی قیر لەجادەکەی خوارێ پێچ دەکەنەوە دەگەنە ئاواییەك، کە لەودێیە هەڵدەبوون دەگەنە کەندەلانێك، لەوێڕا ئاناوارزا دیارە. بەسەر خاکە قەڵشت قەڵشتەکە تێدەپەڕن. لەپێش خۆتان دارەبەنێکی گەورە دەبینن، ئەوجار بەلای ڕاستدا بادەدەنەوە. کاتێك وەرسوڕان لەپێش خۆتان مەیدانێکی ئاوالای لووس دەبینن، کە پڕە لە تەختە بەردی پڕ لە نەخش و نیگار. بەبێ ئەوەی پێیان لەسەردانێن هەڵدەبن. ئەوجار بەرەو قیبلە ئەو جێگایەی ڕۆژبای لێڕاهەڵدەکاو هەورە سپییەکان لێی کۆدەبنەوە، لێیدەسوڕێنەوە. گردێکی لەبەرامبەری خۆتان دەبینن، کاتێك چاوتان بە گردەکە کەوت، لە شوێنی خۆتان ڕادەوەستن و نابزوون تا سپێدە دەنگوێ. ئەوکاتی بەرەولای گردەکە وەڕێدەکەون و دەچن لەبن دارهەنارەکە دادەنیشن. باشە ئەوجار باوەگەڕێن بۆ ماڵێ.

ژنە لەپێشداو ئەوانی دیکەش بەدوایدا خێرا گەڕانەوە بۆ ماڵێ. ژنە چوەژووریٚ و بەبووخچەیەکی گەورەوە گەڕایەوەو گوتی:

- ئەوەم لێوەرگرن. نان و پەنیرو پیوازە. ئێرە چوکوراوایە. لە ڕێیە برسی دەبن.

حەمەد دەستی درێژکردو بووخچەکەی لێوەرگرت و گوتی:

- خوا بتپارێزیٚ خوشکیٚ. یارەبی مرادت حاسڵ بێ.

حەمە چکۆل پێکەنی وگوتی:

- یاخوا مرادت حاسڵ بێ. ئەمنیش لە دارهەنارەکە دەپارێمەوە، ئەو کەسانەی کە کارم بۆ کردوون هەقی خۆم بدەنیٚ. ئەوانیش هەقی خۆم دەدەنیٚ. ئەوجار جووتە گایەکی دەکڕم، ئی شاخ کەوانی.

ئاشق عەلی گوتی:

-حەتمەن دەبیٚ شاخەکانی کەوانی بن. ؟

حەمە چکۆل بە هێمنی گوتی:

-ئەگەر نەشبن گرینگ نییە. بەڵام ئەگەر کەوانی بن باشترە. بەرچاوتر دەبن.

هۆسۆك گوتی:

- ڕاستە. بەرچاوتر دەبن. گا دەبیٚ قۆچەکانی کەوانی بن.

ژنەکە ڕاوەستابوو، بەبیٚ ئەوەی بزانیٚ ئەوان دەڵێن چی پێکەنی و بەچاوە پڕ گنجەکانی تەماشای دەکردن.

- خوشکە باشەکەم. خوشکە مێهرەبانەکەم. ناوی خۆت پێنەگوتین. ناوت چییە؟ ئەو ناوە جوانەتمان پیٚ بڵیٚ.. .

ژنەکە وەکو کچە جحێڵەیەك سوورهەڵگەڕاو بە شەرمەوە گوتی:

- ناوم ( جەننەتە).. .

- خواحافیز خوشکە باش و ئینسانەکەم. جەننەت خاتوون.

ئەوانی دیکەش گوتیان:

- خواحافیز جەننەت خاتون، خوشکە باش ومێهرەبانەکەمان.

بەرەو ئاناوارزا وەڕێکەوتن.

لوتکەی کێوەکان نووقمی نووربوون. هێندەی نەمابوو زەردە لەسەران بدا. لووتکە چیای دووڵ دووڵ وەکو پارچە بلوورێك دەدرەوشایەوە، لە ئێستاڕا چاوی دەنگاوتن.

زۆر لەدێی دوورکەوتبوونەوە. تا دەوروبەری نیوەڕۆیە خێرا ڕۆیشتن و گەیشتنە سەرچۆمی جەیهان و لە بەندەرەکە ڕاوەستان.

حەمەد گوتی:

- ئەگەر لە چۆمی پەڕینەوە.. .

هۆسۆك:

- باشە براله ئەگەر لە چۆمی پەڕینەوە. ناکا دووبارە خەیاڵت هەبن.

- بڕوانە ئەو گوندەی بەرامبەرمان زۆر گەورەیە. زۆر گەورە دێتە بەرچاو. ڕەنگە ئەوێ کاری لێ پەیدابێ. لەسەر ڕێگاکەمانە.

حەمەچکۆل بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- ئەو سپیدارەی ناوەڕاستی گوندی دەبینی؟ لە منارەش بڵندترە.

هۆسۆك گوتی:

- زۆر سەیرە لە منارەش بەرزترە. هەتا ئێستا سپیداری هێندە بەرزم نەدیتوە.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەمنیش.

حەمەد گوتی:

- باسەرێکی لێ بدەین. ئێستا ئێمە، کە قەستی دارهەنارەکەمان هەیە، بەڵکو ئەونیەتە ببێتە هۆی ئەوەی، کە دارهەنارە پیرۆزەکە گرێیەك لەکارەکەمان بکاتەوە.

هۆسۆك گوتی:

- گرێیەکی کارەکەمان بکاتەوە.. . .

هەموان تەماشای هۆسۆکیان کرد بزانن گاڵتەی دەکا یان نا.؟

هۆسۆك گوتی:

- سەرێکی لێ بدەین. کێ دەزانێ؟ ئەو خوایەی کە یوسفی لەبیرێ نەجات دا.. . .

وسوو لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئێمەش لەبیرێ نەجات دەدا.

وسوو بەرە بەرە ڕوخساری تێکدەچوو. سەروحەدی ئەوەی بوو نۆبەتێی بێنێ. هەموو ڕۆژان لای نیوەڕۆیە، وسوو یان لە ئاگری نۆبەتێدا دەسووتا، یان لەسەرمان ڕەق دەبووەوە.

لەبەندەرەکە، گالیسکەو تراکتۆرو گەلابە، بەڕیز وەستابوون و چاوەڕوانی قەیاغەکەبوون بگەڕێتەوە. قەیاغەدارەکە، بەسیمێکی ئەستوور بەسترابووەوەو سیمەکە بەغەرغەرەیەکی ئاسنەوە بۆ ئەوبەری ڕاکێشرابوو، قەیاغەوانەکان بەدەست ڕایان دەکێشا.

حەمەد هەمیشە کاتێك سواری قەیاغ دەبوو، بۆنی دارکاجی بەبەر لووتیدا دەهات و بیری لە لێرەوارە دارکاجەکان دەکردەوە.

کاتێك لەقەیاغەکە دادەبەزین، ویستیان پارە بدەنە قەیاغەوانەکە، بەلاّم قەیاغەوان گوتی:

- نا.. پێویست ناکات. ئەمن پارەو لێوەرناگرم.

تفێکی گەورەی لەچۆمی کردو بەتووڕەیی دەستی کرد بە جنێودانی چوکوراواو گوتی:

- ئەمن خوشك و دایکی ئەو چوکوراوایەی.. . . . بڕۆن خۆتان بگەیەننەوە کوێستانێ، دەنا هەمووتان لێرە دەمرن.

تازە خەلّکی ئێرە خێریان لێ هەلّناوەرێ.

هۆسۆك گوتی:

- لێیان هەلّناوەرێ، زۆر سوپاس براگیان.

کە لە قەیاغەکە دابەزین ڕوویان کردە ئەو دێیەی کە سپیدارە بەرزەکەی لێبوو. لای نیوەڕۆیە دووبارە وسوو دەستی کردەوە بە لەرزین و گوتی:

- گرینگ نییە براینە. گوێ مەدەنێ. بە هەرحالّ ئەوە بەرەو لای دارهەناری سەرگردەکە دەچین. بڕوانن زۆرمان نەماوە بگەینە ئەو دێیەی.. . . ئەگەرکارێکمان دەست کەوێ و منیش بتوانم کاربکەم، چاك دەبمەوە. هەمیشە ئاوامە هەر کاتێك کارم پەیداکرد چاکدەبمەوە.

هۆسۆك چەند جاران ویستی وسووی لە کۆلّێ کا، بەلاّم وسوو دەیگوت:

- نا، نامەوێ، ئەوە وردە وردە دەڕۆم. ئۆخەی ی ی.. . . . ئەمن ئەوا دەڕۆم.

حەمە چکۆل چوو بنپیلی گرت، وسوو هەولّی دا قۆلّی لە دەستی دەرێنێ. هۆسۆك فەرماندەرانە گوتی:

- وسوو، لێگەڕێ با کوڕەکە پیلت بگرێ. پێی خۆشە یارمەتیت بدا ئەتۆ ناتوانی بەبێ یاریدەکردن بڕۆی.

وسوو بێدەنگ بوو.

نیوەڕۆ لایدابوو، کە گەیشتنە گوندی دار سپیدارەکە. ڕۆژبایەکی تووند هەلّی کردبوو. چرپ و چالێکی زۆر سەربان و بەر دەرگاکانی داپۆشی بوو، گێژەلّووکە لەنێو مالّەکان بەرەو

ئاسمان هەڵدەچوو. گژوگیای لول دەداو پەرش و بلاوی دەکردەوەو هەمووشتێکی تێکوپێك دەداو پاشان بەرەو لای لووتکەی (دوومڵوو) تێهەڵدەکشا.

گێژەڵوکەیەك هات و بۆ ماوەیەك لەنێو خۆی گرتن. دەم و لووتیان پڕبوو لەتەپ وتۆز. نەیاندەتوانی یەك لەحزەش چاوهەڵێنن و دەرگاو دیواری ماڵەکان ببینن.

سەرەنجام بەدەستەکوتێ و کوێرەکوێرە سپیدارەکەی ناوەڕاستی ئاواییان دیتەوە. لەوێش لەبن دارێك ترومپایەکی سووری لێبوو. وسوو هەرکە گەیشتە وێ خۆی بە عەرزی داداو لەنێو ئەو تەپوتۆزەدا، دەستی کرد بەناڵەناڵ و گینگڵ دان و دەست و پێڕا وەشاندن.

- گەردنم ئازادکەن. کاکە. ئەمن ئەوە خەریکە دەمرم براینە.. . .

لێرەش لەسەر چالاوەکە گوڵی بادروو و ڕیحانەیان لێ چاندبوون. بادییە بەردەکەی ژێر ترومپایەکە زۆر قەدیمی بوو.

لەبەردی گرانێت بوو. کە خەتی شینی بەنێودا هاتبوون، جێی دەنەفەران دەبووەوە.

لەپەنای دانیشتن و ماوەیەك حەسانەوە. ڕۆژ با، کە هەموو جێگایەکی بە تەپوتۆز داپۆشیبوو، بەرە بەرە توندتر دەبوو. خەریکبوو دەست و دەم و چاویان بشۆن.

ئاشق عەلی گوتی:

- نەکا دەست و چاوتان تەڕکەن. یەکسەر قوڕاوی دەبن.

لای ئێوارێ ڕۆژبایەکە کزی کردو ئەوانیش یەك یەك هەستان و چوون دەست و چاویان شرد. ئێستاش وسوو هەر لەسەر زەوی کەوتبوو دەست و پێی ڕادەوەشاند. ئەویشیان هەڵستاند و دەست وچاویان شرد.

ماوەیەك چاوەڕوان بوون، بەلام هیچ کەس بەسەرجادە بەلایاندا تێنەپەڕی. چوکترین دەنگ لەدێی نەدەهات.

حەمەد:

- ئەو دێیە چی لێقەوماوە.؟

هۆسۆك:

- ڕەنگە چووبنە کوێستانێ.. . .

ئاشق عەلی:

- ئێستا پەیدادەبنەوە، لەنێو کێڵگەن. تازەخۆرئاوا بووە.

لەو مابەینەدا، تراکتۆرو گەلابەو داشقەو پێڕۆ گەیشتنەوە ناو ئاوایی. یەکسەر دێ پڕبوو لەخەڵك.

دوای کەمێك ئۆتۆمۆبێلێك هات و لەپەنای جادە ڕاوەستا، پیاوێکی بالابەرزی چەکمە لەپێی سمێڵ شۆڕ، کە کلاوێکی حەسیری گەرگەڕی لەسەرنابوو و قامچییەکی بەدەستەوەبوو لێی دابەزی و بەرەو ڕوویان هات.

دەست بەجێ هەستانە سەرپێ و خۆیان کۆکردەوەو بەڕیز ڕاوەستان.

- خەڵکی کوێستانێن؟

- بەڵێ کوێستانیین.

- کرێکارن؟

- ئا، بەڵێ.

- چ کارێکی دەزانن.؟

- هەموو کارێك.

- کرێی ڕۆژانەتان چەندە.؟

- هەرچەندێکی بێ.

کابرا کە بە فیز ڕاوەستابوو و تووڕەبوو، قەمچییەکەی سێ جاران ڕاوەشاند:

- ئەو جۆرە کرێکارانە بە کەڵکی من نایەن. ( هەرچەندێکی بماندەنێ!) دیارە ئێوە ئای کارکردنتان نییە.؟ لە برسان وەکو سەگ گڕوێ بوون.

ئاشق عەلی کۆڵە گرووی لە ئەوکێ مابوو بە هێمنی گوتی:

- قسەی جوان بکە کاکە.

دڵشکاوو تووڕە بوو.

کابرا بەهەمان ڕق و کینەوە هەنگاوێکی لێ چووەپێش.

- ئای.. . . کاکم ناڕەحەت بووە.؟

ئاشق عەلی:

- ناڕەحەت بووم.

کابرا هەنگاوێکی دیکەش چووەپێش. دەستی ڕاداشت و قامکی لە تێلێکی سازەکەیدا. دەنگێکی درێژی لێ بەرزبووەوە.

- ئەتۆ خۆشخوانی.؟

- وا دەڵێن. دیارە ئەگەر خوا پێمان ببەخشێ.

- ئەتۆ بە کەڵکی من دێی. ئەگەر ساز بۆ کرێکارەکان لێبدەی پارەت دەدەمێ قوربان!

کابرا بەئاشکرا دەیویست گاڵتەی پێبکا. ئاشق عەلی دڵی پڕبوو.

- خوا پترتان بداتێ. نامەوێ.

- کەواتە دیارە نیگەران بووی قوربان!

- بەڵێ نیگەران بووم.

- لەچی نارەحەت دەبی ناپیاو. ! هەموو ڕۆژێ دەپازدە خۆشخوانی وەکو تۆ لەبەردەرکی ماڵەکەم کەوتوون.. . .

حەمەد بە ڕووقایمی و بە هێندنەگرتنی قسەکەی پێ بڕی وگوتی:

- ئەوە ئاشق عەلییە. بابیشی ناوی ئاشق حسێن بوو، ناوبانگی لەگەرمێن و کوێستانێ گەڕاوە. باپیریشی ناوی ئاشق خەلیل بوو. ناوی لەعەشیرەتی ئەفشاردا لەسەر زارو زمانانە. بابی ویش ( دادالێ ئۆغلۆ) ی گەورەیە. ئاشق عەلی لەتیرەی دادالێ ئۆغلۆویە. ئەتۆ بەو ڕەفتارەت کارێکی باشت نەکرد.

- ناپیاوی گەلێر، ئەتۆ هێندەی نەماوە ئەسڵ ونەسەبی بەرییەوە سەر عوسمانییەکان یان بیبەیەوە سەر مستەفا کەمال.

- ئەو لەوەچەی دادالێ ئۆغلۆویە. بەرەبابێکی گەورەن ئاغا.

- چی؟ لەبەرەبابی چی؟

- لەبەرەبابی دادالێ ئۆغلۆو.

- دادالێ ئۆغلۆو! دادالێ ئۆغلۆو کێیە؟ تارژەنێکی قەرەج؟.. . . .

ئاشق عەلی کە لەرقان هەڵدەلەرزی هاواری کرد:

- حەمەد بێدەنگ بە! ئەوەنی ئەوەنییە قسانی لەگەڵ بکەی.

کابراش شیڕاندی و گوتی:

- ئێوەی لە برسان مردوو چۆن لەخۆڕادەبینن.. . چۆن.. . .

لەو بەینەدا چەند دێهاتییەك لێیان کۆبوونەوە.

یەکێك هاتە نێوانیانەوە و گوتی:

-لەسەرخۆبە ئاغا، لەسەرخۆ. ئەوانە لە کوێرا بزانن ئەتۆ کێی. ئەگەر زانیبایان چما دەکرا لە خزمەت جەنابت باسی ئەسڵ ونەسەبەی بکەن. !

ئاغا بە ڕقەوە ڕووی وەرسوڕاند:

-پێیان بڵێ ئەمن کێم. بۆم باسی داداڵ ئۆغڵوو و ئەسڵ و ئەسەبەی دەکەن! ناپیاو، ئەتۆ ئەگەر لە بەرەبابێکی گەورەی ئەدی بۆچی تووشی ئەو ڕۆژگارەی بووی.؟

حەمەد گوتی:

-خودانەبێ، هەموو کەسێك گرفتاردەبێ. ئێمە وەدوای کارکەوتووین. پارەی خوێتی خۆمان وەردەگرین و دەیخۆین.

کابرا دووبارە بە سووکایەتی پێکردنەوە گوتی:

-ئەگەر وایە لێرە چ دەکەن.؟ نەجیبزادە بەڕێزەکان!

پاشان گەڕایەوە سەر دێهاتییەکان کە لەولای ڕاوەستابوون گوتی:

-هەرئێستا ئەوانە لەدێی وەدەرنێن. یەك کەسی کوێستانێ نەبەنە سەرکێڵگەکانتان. بژی تراکتۆر. بژی دەڕاسە. ئێمە تازە هیچ مەجبوورنین بۆگەنیوی ئەو ئاغا نەجیبزادانە هەڵبگرین. ! وەی نەجیبزادەکانی من.وەی! ئەو ئاغایانە لەبەرەبابی داداڵ ئۆغڵوون. کوڕەبژی ( مارشاڵ.. . . مارشاڵ.. . (ئیشارەیە بۆ جۆری شەریکەی مارشاڵ. ).

سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو:

-ئەوانە لەدێی دەرکەن. هەر ئێستا. دەنا ئەمشەو ماڵەکانمان تاڵان دەکەن. ئەوانە لەو دزانەن.. . ئەمن ئێشانم دەدان.. . بەڵام شوکری خوای بکەن کە ئێستا کارم هەیە. ئیدی لێرە نەتان بینمەوە. نیو سەعاتی دیکە دەگەڕێمەوە.خوا دەزانێ چ بەڵایەکتان بەسەردێنم.

ئۆتۆمبێلەکەی لێخوڕی.

دێهاتییەکان گوتیان:

-شوکر بۆ خوا کە لەبەر دەستی نەجاتتان بوو. ئاغا ڕوحمی پێکردن، دەنا بەقامچییەکەی پارچە پارچەی دەکردن.

زۆرو ئاغا تووڕەکرد. پیاو نابێ قسە لەقسەی ئاغای بکات. ئامان.. . هەتا زووە لێرە بڕۆن، هەر ئێستا.. . پاش تاوێکی دیکە دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئێوەش لێرە نەبینێتەوە، لەگەڵ پێنج کەسی مل ئەستوور وەدواتان دەکەوێ و دەتانگرێتەوە، وەبەر قەمچیان و دەدات. ئەوە ئاغایەکی زۆر باشە. بەڵام ئەوکارەی زۆر خراپە. ئێوە هەڵەتان کرد، ئەگەر بێدەنگبان وجوابتان نەدابایەوە، حەتمەن کاری دەدانێ. ئێستاش نابێ خۆتانی پیشاندەن. نەکا بەجادەیدا بڕۆن.

بەوێدا بڕۆن خۆتان دەگەیەنێتێ و تابەیانی بە قامچیان دەتانکوژێ.

حەمەد دەیویست قسە بکا، بەڵام ئاشق عەلی دەستی بە دەمییەوە ناو بێ ئەوەی قسەیەك بکەن چوونە بنپیلی وسوو و وەڕێکەوتن.

هۆسۆك ددانی لەچیڕەوە دەبرد.

کاتێك لە دێی وەدەردەکەوتن، ئاشق عەلی گوتی:

-بە جادەیدا مەڕۆن. پیاو خۆی لە سەگی بپارێزێ باشترە.

هۆسۆك گوتی:

-نا، بە جادەیدا دەڕۆین. لێگەڕێ با وەدوامان کەوێ، هەتا هەقی خۆی لە مستێ نێین.

حەمەدگوتی:

-چەکمان پێ نییە. بریا دەمانچەیەکمان پێ با.

ئاشق عەلی گوتی:

-باش بووکە پێمان نەبوو.

هۆسۆك گوتی:

-ئەمن خەنجەرم پێیە.

ئاشق عەلی گوتی:

-هۆسۆك کەللەشەقییە مەکە. ئێمە لە هەمور لاوە نەگبەتیمان بۆ هاتووە. ئەتۆش.. .

دەنگی ئەوەندە ناومێدانەو خەفەتبارانەبوو، کە هۆسۆك ئیدی هیچی نەگوت. کاتێك دەیانویست بەرەو کێڵگە لێهاڵێن، لەپێش وسوو هەڵتروشکاو گوتی:

-وسوو وەرە کۆڵێم.

قسەیەکی دیکەی نەکرد. زاری هەڵنەپچڕا. ڕقێك بە قەددر مشتەکۆڵەیەك لە ئەوکێی گیرا. کەمێك دوورتر جۆگەلەیەك لە چۆمیڕا دەچووە مەرەزەجاڕەکە. نارەوەنەکان لەدوورەوە دەرکەوتن. بەرەو ئەوێ ڕۆیشتن. مانگ لەنێوەڕاستی ئاسمانێ بوو، لەوێڕا شاخەکانی ئاناوارزا وەکو ڕۆژی رووناك دیاربوون و دەتگوت باڵندەیەکی گەورەیەو دەیەوێت بفڕێت. لەجادەکەی بەرامبەریان ئۆتۆمبێل و گەلابەو دەڕاسە، تێدەپەڕین و شۆقی گلۆپەکانیان دەشتەکەیان ڕووناك دەکردەوە. کاتێك گەیشتنە بن دارە نارەوەنەکە، شەکەت و ماندوو لەسەرعەرزێ لێی تخێلێ بوون.

یەك قسەشیان لەگەڵ یەكتری نەكرد. هەموویان بێدەنگ بوون. تەنانەت وسووش لەناڵەناڵ كەوتبوو بێجووڵە، وەكوو مردووان لەسەر عەرزێ درێژببوو.

بۆ یەكەمین جار لەدوای هاتنیان بۆ چوكوراوا، ئاشق عەلی حەزی دەكرد جگەرەیەك بكێشێ. ئاخ، ئەگەر ئێستا عەلی جگەرەیەكی پەیدادەكرد. دووكەڵەكەی تا قوڵایی ناخی هەڵدەمژی. هەڵیدەمژی و هەڵیدەمژی.. . .

نە ئاگریان كردەوەو نە بیریان لە نان خواردن كردەوەو نە ئاگاشیان لە هێرشی تەپۆیان بوو. تابەیانی یەك چركەش خەو لە چاویان نەكەوت و هەروادرێژ ببوون. تا ئەو كاتەی پۆلە باڵندەیەك بەسەریاندا تێپەڕین. چاویان لەئاسمانەوە بڕیبوو، كە بەرەبەرە ڕووناك دەبۆوە. لوتكە چیاكانی (گاور) بەیەكەمین زەردەی خۆر وەكو قەسرێكی بلوورین درەوشایەوە.

حەمەد هەستایە سەرپێ. بە پشتی دەستی چاوەكانی هەڵگلۆفین و بەرە وچۆمی وەڕێكەوت. لەسەرزگ درێژبوو سەروچاوی شردن. لەدوای ئەویش ئەوانی دیكە هاتن و هەمان كاریان كرد. پاشان لە پەنا گوڵە هێرۆیەكان كۆبوونەوە و ڕاوەستان. پاش كەمێك لەخۆڕا بەرەولای ڕۆژ هەڵات و بەرەو چیای دووڵدووڵ ملی ڕێیان گرت.

زەردەی خۆر لە چیای دووڵدووڵی دابوو، لوتكەی چیاكە وەكو ئەستێرەیەك دەدرەوشایەوە.

ئەو ڕۆژ وسوو حاڵی باش بوو، نە سەرمای بوو، نە گەرما. نەیاندەتوانی تەماشای یەكتری بكەن. حەمە چكۆلیش سەری هەڵنەدەهێنا. سەڵەهای ساڵ بوو لەژێر زوڵم و ستەمدا شوانی دەكرد. هەموو هەقیشیان خواردبوو. بەڵام تائێستا هیچ كەس وەكو دوێنێ سووكایەتی پێنەكردبوو. ئەو ئازارەی كە لە دڵیدا بوو، ئاگری تێبەردەداو نەیدەزانی چ بكات.

كاتێك ئەو پیاوە گاڵتەو سووكایەتی پێدەكردن. دڵی بە هەمووان دەسووتا، بە حەمەدی كەگرمۆڵەببوو و دۆش دامابوو، بەهۆسۆك كە لە ئائومێدیان گینگڵی دەدا. بە ئاشق عەلی كە لە شەرمان بەدوای كونێكدا دەگەڕا تا خۆی تێدا وەشێرێ. بەوسووی كە لەسەر عەرزێ لەنێو ئەو تەپوتۆزەیدا دەست و پێی ڕادەوەشاندن و ناڵەناڵی وەكو هاوارێك لەگەرووی دەهاتەدەرێ.

ڕەنگە تائێستا ئەوانە، لە هەموو تەمەنیاندا، ئاوا هەستیان بریندار نەكرابێ. ئەگەر لە حەمە چكۆلی گەڕابان بە تاقی تەنێ دەچووە ئەوبەری سەر شاخەكانی ئاناوارزاو لەوێ ماوەیەك زووڕ زووڕ دەگریاو پاشان خۆی دەزاری ڕەشمارە گەورەو ئینسان خۆرەكان داویشت. تابەیانی چەندان بیر بە مێشكیدا تێپەڕین. دەربارەی ئەو پیاوە ئۆتۆمبێل سوارەو ئەودێیەو

دارسپیدارەکە. . . حەزی دەکرد مەشخەڵێك بەدەستەوەبگرێ و سەرتاسەری ئەو دێیە ئاور تێبەردا.

لە بوولێڵی بەیانیدا لە نێوەڕاستی دەشتێ ڕاوەستابوون. حەمەد ملە درێژەکەی لێکدا لێکدا بە چەپ و ڕاستدا دەسووڕاند دەتگوت بەدوای شتێکدا دەگەڕێت و نایبینێتەوە. هیچ شتێك لە ڕوخساریدا نەدەخوێندرایەوە. ئەوانی دیکەش کەوتبوونە ژێر کاریگەری وی. هەمان کاریان دووبارە دەکردەوە. حەمەد یەك لەحزە ڕاوەستا دەتگوت ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێ دیتوویەتەوە. ڕوخساری کرایەوە، بەپێکەنینەوە تەماشای ئەوانی کردو بەرەو شاخەکانی ئاناوارزا وەر سوڕاو وەڕێکەوت. ئەوانی دیکەش بە پێکەنینەوە، وەدوای کەوتن. حەمە چکۆل ماوەیەك لەجێگای خۆی نەبزوت. سەری بەردابۆوەو لەبیرکردنەوەدیەکی قووڵدا بوو. لەناکاو سەری هەڵێناو بەغاردان وەدوایان کەوت. بە نێو گوڵە هێرۆیەکاندا تێپەڕین کە بەقەد باڵای پیاوێك هەڵچوبوون، گوڵە پەمەیی و کەسك و شین و سوورەکانیان بە ئەندازەی لەپە دەستێك دەبوون. بەنێو پەڵە نووسەکەیەکدا تێپەڕین، کە تاپشتێندیان دەهات.

بەنێو پەرێزێکدا تێپەڕین کە لاسکەکانیان تا ئەژنۆیان دەهاتن. لە چاڵەکان چوونەخوارێ و وەسەرکەوتنەوە، بەسەرجۆگا پڕ لە ئاوەکاندا بازیانداو لای نیوەڕۆیە گەیشتنە بناری ئاناوارزا. گەرمایەکە زۆر بەتین بوو. خاکەکە وەکوخۆڵەمێشی تەندوورێ گەرم بوو. شاخەکانی ئاناوارزا لەتیشکدانەوەی چۆمی جەیهان کە بەتەنیشتیدا تێدەپەڕی، دەدرەوشایەوەو تیشکی شەپۆلەکان چاوی دەنگاوت.

چۆمەکە لێرە خوڕنەبوو. وەکو لافاوێکی نور بە دەشتەکەدا بڵاودبووەوە. کاتێك بەناو قەڵشت و کەندرەکانی چۆمیدا دەڕۆیشتن، لەدووریڕا چاویان بەبێستانێکی سەوزو پڕ کەوت. کە سەوزاییەکەی دەستبەجێ بنیادەمی فێنك دەکردەوە.

شەلاڵی ئارەق ببوون و هەناسەیان سواربوو. لەوکاتەدا چاویان لە بێستانەکە وەرگێڕاو تەماشای وسوویان کرد.

وسوو ئەورۆش نەخۆش نەبوو. جاران هەموو ڕۆژێ دانی نیوەڕۆیە خۆی بە عەرزی دادەداو بە نالەنالەوە دەیگوت: ( سووتام، ڕەقبوومەوە). بەبێ ئەوەی هیچ بڵێن بێ مەقسەد ڕێگای بێستانیان گرتەبەر. لەچوونیان بۆ ئەوێ هیچ ئامانجێکیان نەبوو. تەنیا غەریزە بوو. وەکو غەریزەی باڵندان. . . لەو دەشتەیدا، بنیادەم، چوارپێ، باڵندەو پەپوولە، لەوگەرما سوتێنەرەیدا بۆ دەربازبوونی گیانیان خۆیان دەگەیاندە ئەو دەوروبەرە سەر سەوزە. لەو

گەرمایەداهیچ بوونەوەرێك بەرەولای چۆمی نەدەچوو، کە وەك مسی سوورەوەبوو دەڕۆیشت و هەموو تیشکی خۆری ڕادەکێشاو بلاوی دەکردەوە. بەپێچەوانە لەبەری هەلدەهاتن و بەرەو ئەو مەلبەندە سەرسەوزە هێرشیان دەبرد. تەنانەت مارو جرِوجانەوەرە جۆراوجۆرەکانیش پەنایان دەبردە ئەوێ. هەزاران پەرەسێلکە بەسەر بێستانەکە، وەکو تیر دەهاتن و دەچوون و کۆما تەپۆو مێشولەیان ڕاودەکرد.

گەیشتنە داوێنی بێستانەکەو لە تەنیشت یەك ڕاوەستان. بۆنێکی وەکو بۆنی گۆلاوێکی سەوزدا وەستاویان هاتە بەر لووتی. ئەو بۆنەیان بە قولایی سییەکانیان هەلمژی. بێستانەکە چۆل و هۆل بوو. شوتی و کالەکی بێستانەکە پێگەیشتبوون. گەورە گەورەو بەربلاو لە پەنا ئەو چلەگولانەی کە تا ئەژنۆیان دەهاتن و گولی پەمەیی و زەردو شینیان دابوو، بەسەریەکدا کەوتبون. برکە کولەکەی گلۆوکە زەرد لە پەنا ساباتەکەوە بە درێژایی لای ڕاستی هەتادەگەیشتە کن شۆڕەبییەکە بە ڕیز ڕوابوون.. . . چاویان بە پیاوێکی کەوت، کە لەژێر ساباتەکە نوستبوو. بەلام بەکەلکی چی دەهات.

هۆسۆك:

- چۆنە بچینە لای ساباتەکەو لەوێ لەژێر سێبەری شۆڕەکە دانیشین.

حەمەد بە تامەزرۆییەوە قۆلی هۆسۆکی گرت و گوتی:

- چ کارێکمان هەیە بچینە وێ. خەلکی چوکوراوا زۆر سەیر گۆڕاون. وەرە با لێرە لەسەرئەوجۆگایەی دانیشین و نانەکەمان بخۆین ئێرە لە هەمووی باشترە.

وسوو بەدەم و چاوە درێژو تێکچرژاوەکەی خۆیەوە پێکەنی. ددانەکانی سپی و درێژبوون گوتی:

- خوا دەزانێ، خوا دەزانێ کە سێبەری ئەو شۆڕەبییە چەندە فێنکە. بروانن لەژێر ساباتەکەش پیاوێکی ڕیوەلەی لێ نوستووە.

- باشە با ڕیوەلەش بێ. تەماشاکە تفەنگەکەی بە ئەستوندەکی ساباتەکەی هەلواسیوە. باش چاوت بکەوەوتەماشای کە.

وسوو:

- مەبەستم ئەوەبوو کە ڕیوەلەیە. لەوانەشە مندال بێ.. .

ناشق عەلی بێ ئەوەی شتێك بڵێ لەجۆگەکە بازی داو بەرەو لای شۆڕەبییەکە وەڕێکەوت. ئەوانی دیکەش پاش کەمێك ماتڵ بوون وەدوای کەوتن. ناشق عەلی کاتێك گەیشتە نزیك ساباتەکە بەدەنگێکی بەرز گوتی:

-سلاّوت لێبێ.

ئەوکابرایەی کە لەژێر ساباتەکە نوستبوو لەجێی خۆی دەرپەڕی وگوتی:

-سلاّو لە ئێوەش.

ڕوخساری پڕ بوو لەشادی. ئاشق عەلی هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا.

-خەریکبوو لەگەرمان بخنکێین. گوتمان ئەگەر ڕێگامان بدەی نانەکەمان لەبن سێبەری ئەو شۆڕەبییە دەخۆین.

بێستانەوان بەرەو لایان ڕۆیشت و گوتی:

-فەرموون، فەرموون ماڵی خۆتانە، فەرمون.

کابرا وای پێشوازی لێکردن، کە سەریان لێ سوڕما.

-فەرموون بۆ ئێرە. ئەوێ مێرگە پڕ لە ئاوو قوڕە، فەرموون بازدەنە ئێرە.

لە پێشدا ئاشق عەلی و لە دوای ویش ئەوانی دیکە ئەو شوێنەی بێستانەوان دەستنیشانی کردبوو بازیان دا بۆ بن سێبەری شۆڕەبییەکە.

کاتێك شنەبایەکی فێنك لەڕوخساری دان هەستیان بە خۆشحاڵی کرد. بێستانەوان حەسیرێکی گەورەی لەبن ساباتەکەڕا هێناو لەژێر سێبەری شۆڕەبییەکە ڕایخست.

-بەخێربێن، خێرو بەرەکەت و هێنا. فەرموون دانیشن.

ئەوانیش گوتیان:

-خوا ڕاوەستاوت کا.

بەلاّم بیریان نەبوو لەسەرحەسیرەکە دانیشن.

-فەرمون دانیشن براینە.

دەنگی بێستانەوان پڕبوو لەشادی و خۆشی. ئەوانیش بە سەرسوڕماوی ڕاوەستابوون و جوولەیان نەدەکرد.

ئەوەی لەپێش هەمواندا هاتەوە سەرخۆ، دووبارە عەلی بوو. چوو پاڵی بەقەدی شۆڕەبییەکەوە داو لێی دانیشت.

بێستانەوان بەدەستەپاچەیی چووە پێشێ و گوتی:

-کوڕینە ئێرە عەرزەکەی شێدارە. فەرموون لە شوێنی ئیشك دانیشن. وریابن با نەخۆش نەبن. . . .

قولینچکی حەسیرەکەی گرتبوو بەرەو لای عەلی ڕایکێشا.

-یاخوا بەخێربێن کوڕینە. خێروبەرەکەت و هێنا.

ڕووی لەحازریان کرد:

-خوا دەزانێ کە لەو گەرمایەدا چ ئازارێکتان کێشاوە. خوا دەزانێ کە لەکوێڕا هاتوون و چەندە ماندوون.

خوا دەزانێ. دانیشن و بحەسێنەوە. خوا دەزانێ چەندە و برسییە. ئێستا فەرموون دانیشن و کەمێك بحەسێنەوە، منیش دەچم بۆ ئێوە. . . .

لەخۆشیان لەکەوڵی خۆیدا نەدەگونجا. دەست و پێی خۆی ون کردبوو.

ئەوانی دیکەش چوون لەپەنا ئاشق عەلی لەسەر حەسیرەکە دانیشتن.

-ئێستاش فەموو ناوی جەنابت بڵێ.

ئاشق عەلی گوتی:

-ئەمن ناوم عەلییە.

-خۆشخوانی.؟

-ئەگەر خودا پێمان ببەخشێ.

-زۆرباشە کەواتە خۆشخوانی. . . .

حەمەچکۆل گوتی:

-ئەوە مام ئاشق عەلییە، بە ئاوازەکەی زمانی لالان دەکاتەوە. مردووان زیندوودەکاتەوە. کێوو بەردان دەتوێنێتەوە.

ئەو مام ئاشق عەلییە ئەگەر گۆرانی بڵێ، گوڵ و باڵندەو ئەو دارەو تەنانەت زەویش دێنێتە زمان. لەو چیا سەرکەشانە، لەسەرتاسەری توورووس، لە ئالاداغ، لە بێن بۆغا، چیای گاور، هیچ کەسێك نییە ناوی ئەوی نەبیستبێ. هەرکە ناوی ئاشق عەلی هات، منداڵی شیرە خۆرەش لە گریان دەکەون. ئاوی کانیش ڕادەوەستێ.

لەناکاو ئاشق عەلی بەسەر حەمە چکۆلیدا شیڕاند:

-کوڕە بێدەنگ بە.

ڕوویکردە بێستانەوان و گوتی:

-ئەو حەمە چکۆلەیە منداڵە. قسەی حەللەق مەللەق دەکا. گوێی لێڕامەگرە. ئێمە لەکوێ و ئەو خۆشخوانەی ئەو کوڕەش باسی دەکا لەکوێ.. . .

حەمە چکۆل لە خۆشیان باڵی گرتبوو، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

-قسەکانی من هیچ حەللەق مەللەق نین. مام ئاشق عەلی نەزەرکردەیە.

ئاشق عەلی هەناسەیەکی هەڵکێشاو بە راوێژێکی دڵنەوازانەوە گوتی:

-بێدەنگ بە حەمەد. بێدەنگ بە گیانەکەم. بێدەنگ بە.

لەگەڵ بێستانەوانی نیگایان تێك ئاڵقابوو، کە هەروا نوقمی شادی لەجێی خۆی ڕاوەستابوو گوتی:

-ئێستا ئەتۆش وەرەلامان دانیشە.

بێستانەوان گوتی:

-بە چاوان ئاشق گیان.

هەر ئەو جێگایەی لێی ڕاوەستابوو لێی دانیشت.

ئاشق عەلی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی:

-ئەتۆش، ئەی پیاوی باش و جوامێر ئەتۆش لوتف بفەرموو ناوی خۆتمان پێبڵێ. کاکی بێستانەوانم.

-ئەمن ناوم ئەحمەدە (ئەحمەدی شامام ئۆغلوو).

هۆسۆك گوتی:

-یاخوا هەر بژی برای باش و ئینسانمان. ئەمنیش ناوم هۆسۆکە.

-منیش ناوم حەمەدە.

-منیش هەرناوم حەمەیە، بەڵام لەبەر خاتری ئەو مامەم، پێم دەڵێن حەمە چکۆل.

-ئەمنیش وسووم.

حەمە چکۆل گوتی:

-ئەو زۆر نەخۆشە. تەنیا ئەورۆ نۆبەتیی نەهاتوونێ. کاتێك تای دێتێ، عەرزی بە نینۆکان هەڵدەدڕێ و دەنێوخۆڵ و قوڕێدا دەگەوزێ و چاوی لەکالانەی دێنەدەرێ.. . .

حەمەد قسەکەی پێبڕی:

-ئەگەر کارمان دەست کەوت و خاوەن کاریش هەقەکەی دا بە حەمە چکۆلی، ئەوا دەیەوێت جووتێك گای شاخ کەوانی بکڕێ. شاخەکانی ڕاست وەکو کەوانەی مانگێ.

ـەمە چکۆل بە خۆشحالّییەوە قسەکەی دووبارە کردەوە:

- شاخەکانی ڕاست وەکو کەوانەی مانگیٚ.

ئەحمەدی بێستانەوان لەناکاو بە دەستەپاچەیی لە شوێنی خۆی دەرپەڕی و گوتی:

- ئەی هاوار خاك بەسەرم! ئێستا ئێوە تینوو و برسین. ئەمن چ بنیادەمێکی بیٚ مێشکم! بڕوانن ئەمن لێرە چالآوێکم هەیە ئاوەکەی وەکو ئاوی کانی ساردو فێنکە.

غاری داو سەتلّەکەی بەردایە ناوچالآوەکەو دەست بەجیٚ هەلّیکیشایەوەو هێنایی و گوتی:

- فەرموون بخۆنەوە.

لەپێشدا وە ئاشق عەلیدا:

- ئەمنیش دەچم بۆ میوانە خۆشەویستەکانم چێشتیٚ لێدەنێم.

هۆسۆك گوتی:

-با ئێمەش بێین یارمەتیت بدەین. ئەتۆ خۆت ماندوو مەکە.

-ئەمن ماندوو نابم. ئێوە پشوویەك بدەن. خواردنەکە حازرە. دەمەویٚ لەگەلّ شۆرباو بامیەی، پلآوبرِوێشیشتان بۆ لێبنێم.هەرئێستا سازدەبیٚ.

حەمەد گوتی:

-خۆت ماندوو مەکە برالە.

حەمە چکۆلیش گوتی:

-خۆت ماندوو مەکە باشترین پیاوی چوکوراوا.

ئاشق عەلیش گوتی:

-خۆت ماندوومەکە.

بێستانەوان ئەو بڕکەدارە وشکانەی لەویٚ بوون، لە ئاورگەکەدا شقارتەیەکی پێوەنا. ئاورەکە هەلّبوو. قابلەمەیەکی دووکەلآوی لەولای بوو. ئاوو برِوێش و خوێی تێکردو لەسەر ئاورەکەی داناو لێی کشایەوە.

بە خۆشحالّییەوە تەماشای ئەو پیاوانەی دەکرد، کە لەلای دانیشتبوون و پێدەکەنی. جارجار دەفکرەوە دەچوو پاشان دووبارە بە دلّشادییەوە پێدەکەنی. بە پەلەپەل گوتی:

-کاتێك پێدەگات.. . . ئای ئەمن چەندە بنیادەمێکی بیٚ مێشکم.. . ئێستا بۆ میوانەکانم شووتی و کالّەکی فێنك دێنم.. .

غاری داو چوو له کۆختێك که به چیلکه و چاڵ دروستی کردبوو، داهاتەوەو چەند کاڵەك و شوتی هێنانەدەرێ و به باوەشی هەڵیگرتن، بەڵام کاڵەکەکانی لێ بەربوونەوە. کاتێك دەیویست هەڵیان گرێتەوە حەمە چکۆل و حەمەد بەغاردان هاتنەلای و گوتیان:

-ئەتۆ خۆت ماندوو مەکە کاکە.

کاڵەك و شووتییەکانیان لێ وەرگرتن و هێنایاننە بن سێبەری شۆڕەبییەکە.

چەقۆتان پێیە؟

هۆسۆك به دەنگێکی بەرز گوتی:

-پێمانە.

ئەحمەد گوتی:

-قاشی کەن و بیخۆن. زۆر فێنکن. لەبن ئەو دڕووانە شووتیەکان تاویان لێ نادا. وەکو تەرزەن. ددانی دەتەزێنن.

-کاکەگیان زۆر سوپاس.

خەنجەرەکەی لەبەر پشتێنێ دەرهێنا، خەنجەرێکی دەستکرد بوو. دەستکاری چەرکەسەکان بوو. تیغەکەی دوو لك بوو.

زۆرگەورە نەبوو. دەسکەکەشی سەدەف و نەخشێنراوبوو. کاتێك بابی له (ساری قامیش) دەجەنگا. ئەو خەنجەرەی لەبەر کەمەری سەربازێکی ڕووس دەرهێنابوو. دارو نەداری هۆسۆکی ئەو خەنجەرە بوو. کاتێك خەریکی شوتی قاشکردن بوو، حەمە چکۆل هەموو شتێکی لەبیرچووبۆوە. وەکو سیحری لێکرابێ چاوی لەخەنجەرەکەوە بڕیبوو، به هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی چاو لەخەنجەرەکە لابەرێت. ئەو حاڵەتەی وی لەبەرچاوی هیچیان ون نەبوو. کاتێك هۆسۆك شوتییەکەی قاش کردو قاشێکی بۆ ڕاداشت، حەمە تازە هاتبۆوە سەرخۆی و قاشەکەی لێوەرگرت.

که شوتییەکە تەواوبوو هۆسۆك شووتییەکی دیکەی قاشکرد.. . پاشان نۆرەی کاڵەکان هات.

لەوەتەی هاتبوونە چوکوراوا، تەنانەت یەك قاشە شووتی یان قاشە کاڵەکێکیان نەخواردبوو. لەکاتێکدا بێستانەکان پڕبوون له شووتی و کاڵەك. به ڕاستیش ئەو کاڵەك و شووتیانە هەر وەکو ئەحمەد دەیگوت وەکو سەهۆڵ ساردبوون.

تا ئەوکاتەی دەنگی پڕ لەشادی بێستانەوانیان گوێ لێبوو، کە گوتی: (پلاوەکە حازرە. ) ئەوانیش هەموو شوتی و کاڵەکەکانیان خواردبوو. تەنانەت توێکڵە کانیشیان بە ددان سپی کردبوون. ئەو مێشانەی کە لەبن شۆڕەبییەکەو لە دەوروبەری ساباتەکەبوون. باڵەکانیان لەژێر تیشکی خۆردا بەرەنگی شین و مەیلەو سەوز دەترووسکانەوە.

-پلاوەکە حازرە، ئەورۆ بەیانی شۆرباو بامیەو گۆشتم لێنابوو. دۆی ساردیشم هەیە. دۆی مەشکێ.

حەمە چکۆل و ئاشق عەلی بە غاردان چوونە لای.. . قابلەمەو مەنجەڵ و کەوڵە پڕ لەنوردووە نانەکەیان هەڵگرت و هێنایانە بن سێبەرێ. کاتێك سەری مەنجەڵەکەیان هەڵگرت، بۆنی خۆشی ڕۆنەکەرە لە پلاوبرویشەکە بەرز بۆوە. دەوروبەری بن سێبەری شۆڕەبییەکەی داگرت.

-فەرموون براینە. نۆشی گیانتان بێ.

یەکەمین کەوچك ئەحمەدی بێستانەوان لە مەنجەڵە پلاوەکەی ڕۆکرد. دوای ئەویش ئاشق عەلی.

-زۆر خۆشت لێناوە کاکە. دەستت خۆشبێ. خودا لەمردوانت خۆشبێ.

-خۆشبی ئاشق.

کوێستانییەکان لێکرا هێرشیان بردە سەر پلاوو شۆرباو بامیەو دۆیەکە. زۆر لەمێژبوو، چێشتی واخۆش و بەتامیان نەخواردبوو. بە بێدەنگی و لەماوەیەکی کەمدا خواردنەکەیان خواردو تێربوون.

ئەحمەدی بێستانەوان:

-ئێستا ئێوە لێرە درێژبن و هەندێك بنوون. ئەمنیش بۆ خواردنی ئێوارێ.. .

لەناکاو لەرزی، بێدەنگ بوو ڕەنگی ڕوخساری ڕەش داگەڕا:

-ئێوە ئەو شەویش لێرەدەمێننەوە، وانییە؟

بەنیگایەکی پاڕانەوە لەچاوی ئاشق عەلییەوە ڕامابوو.

-لێرەدەمێنینەوە، دەمێنینەوە، ناچینە هیچ شوێنێك. ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە. بەیانی وەڕێدەکەوین.

- بۆکوێ؟

-بەدوایدا دەگەڕێین.

-بەدوای چیدا.؟

-بەدوای دارهەناری سەرگردەکە. ئەتۆ هیچت دەربارەی نەبیستووە؟ ئەوەی کە دەڵێن نەزەرکردەیە.. .

-نا، هیچم نەبیستووە. بۆچی بەدوای دارهەناردا دەگەڕێن؟.. .

سێبەری پەژارەیەك ڕوخساری ئاشق عەلی داپۆشی. بە ڕاوێژێکی خەمناکەوە گوتی:

-وسوو زۆر نەخۆشە. نەخۆشی سەرەمەرگ. تەنیا ئەمڕۆ حاڵی باش بوو. بەیانی بۆ خۆشت دەیبینی دەمانەوێ لەو دارەی داوای چاکبوونەوە بۆ وسووی بکەین. دەڵێن ئەو دارە پیرۆزە دەرمانی هەموو دەردانە.

لەناکاو حەمە چکۆل، لەکاتێکدا هەناسەی سوارببوو، پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی:

-یەکی دیکەش ئەوەیە، ئەو دارە نەزەرکردەیە، قەرارە کارمان بۆ پەیدابکا.. . . ئەو ژنە وای گوت. ئەوەی کە خەڵکی گوندە پڕ لە دارەکەبوو، ئەوەی کە خەڵکی کوێستانە پڕ لە بەفرەکەی دووڵدووڵە. گوتی ئەگەر بچن و ئەو دارە نەزەرکردەیەی وەبینن، پارەیەکی زۆرتان پێدەبڕێ. ئێمە سێ مانگە برسی و تینوو لە چوکورراوا سەرگەردان دەسوڕێینەوە. هیچ کەس تەنانەت پارووە نانێکیشی نەداینێ.. . . تەنانەت ئاغاژنی مام حەمەدیش کاری نەداینێ.

سووکایەتی پێکردین.. . دوێنێش، ئەو پیاوە، لەو دێیەی.. . تەنانەت سووکایەتی بە ئاشق عەلیش کرد.

هۆسۆك بە ڕقەوە چاوەکانی دەرپەڕاندن و لەکاتێکدا لێوی دەلەرزین نەڕاندی:

-بێدەنگ بە، سەگبابی زاربلاو.. .

حەمە چکۆل لە ڕاوێژی دەنگی تێکڕابوو.

ئەحمەدی بێستانەوان هەستایە سەرپێ. پیاوێکی کورتەباڵابوو، چاوەکانی گەورەو ڕەش وخەمناك بوون. خەمێك لەڕوخساریدا دیاربوو، خەمێك دەتگوت هەرگیز کۆتایی نایەو نابڕێتەوە.

-ئێوە سەرخەوێك بشکێنن. کەواتە ئەو شەویش لێرەن.؟ زۆر باشە بەیانیش.. . ڕەنگە ئەمن بتوانم نەفەرێکتان بۆ پەیدابکەم، کە شوێنی دارهەنارەکە پێ بزانێ.

وسوو بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

-بۆمان پەیدابکە براله.. . بۆمان پەیداکە، بەڵکو خودا لەو دەردو نەخۆشییە ڕزگارم کا.

-ئێستا ئێوە بنوون و بحەسێنەوە. ئەمنیش بۆ خواردنی ئێوارێ.. . .

- خودا دەست بە عومرتەوە بگرێ کاکی خۆم.

ئەحمەد چوو بۆ نێو بێستانی و خەریکی کارکردن بوو. پاچێکی بەدەستەوە گرت و خەریکی بژارکردن بوو. شێلەگەی جۆگاکەی کردەوەو بێستانەکەی ئاودا. کارەکەی تا ئێواریٚ درێژەی کێشا. ئەوانی دیکەش لەژێر سێبەری شۆڕەبییەکە درێژببوون. بەلاّم خەو لەچاوی هیچیان نەکەوت و یەك قسەشیان بەیەکەوە نەکرد.

کاتێك ئاشق عەلی گوێی لەدەنگی ئەحمەد بوو ڕاستبۆوە. ئەحمەد دووبارە گوتی:

- تەبسیتان بۆ لێدەنێم.؟

ئاشق عەلی گوتی:

- زۆر سوپاس کاکە گیان. دەستت خۆشبیٚ. ئێمە ناتوانین یارمەتییەکت بدەین؟ بڕوانە ئێمە پێنج کەسین.

- چ یارمەتییەك. ئێرە هیچ کارێکی وای لیٚ نییە. شێلەگەکەم کردۆتەوەو یەکسەر سەرتاسەری بێستانەکە ئاو دەدریٚ.

ئاشق عەلی بۆنی هەوای هەلّمژی و گوتی:

- چ بۆنێکی خۆشی لێدیٚ.

- خاك و بێستانی ئاودراو بۆنی خۆشی لێدیٚ.

وسوو گوتی:

- چ بۆنێکی لێدیٚ.

حەمە چکۆلیش لە جێگاکەی دەرپەڕی و گوتی:

- چ بۆنێکی خۆشی لێدیٚ.

هۆسۆکیش گوتی:

- چ بۆنێکی سەیرە. ئەریٚ بە ڕاست ئەو چوکوراوایە چ خاکێکی هەیە.

حەمەد گوتی:

- ئەدی.

سێبەری شۆڕەبییەکە بەرەو لای ڕۆژهەلاّت کشابوو شوێنەکەیان ئاو لێی دابوو.

- ئاومان گەیشتیٚ.

حەمەد گوتی:

- زۆر باشە بالێماندا.

هۆسۆك گوتی:

- چۆنە لە جێگای ئەوەی لێرە ڕاکشێین و لێی تخێڵبین. ئەچین کەمێك یارمەتی ئەو کابرایەی بدەین.؟

وسوو گوتی:

زۆرباشە.

ئاشق عەلی گوتی:

- ئەو جیا لەوەی چەند ڕۆژان لێرە وەمێنین، هیچ شتێکی دیکەی لە ئێمە ناوێ.

هۆسۆك پرسی:

- دەتوانین لێرە وەمێنین.؟

ئاشق عەلی گوتی:

- ناتوانین وەمێنین. ئێمە دەبێ حەتمەن دارهەنارەکە وەبینین.

حەمە چکۆل گوتی:

- بێگومان، ئەمن کاتێك دارهەنارەکەم دیتەوە یەك دوو شتانی لێ دەخوازم.

چووە کن ئەحمەدی کە لەنێو باینجانەکان، باینجانی ڕەش و بریقەداری لێدەکردنەوەو لە بەرچنەکەی داویشتن.

- ئەگەر ئەو دارهەنارەمان دیتەوە ئەمن داوای شتێکی لێدەکەم.. .

ئەحمەد بێ ئەوەی سەرهەڵێنێ هەروا خەریکی باینجان لێکردنەوە بوو پرسی:

- چ شتێك؟.. .

- چ شتێك؟.. . بڕوانە مام ئەحمەد، ڕاوەستە با بۆت وەگێڕم. ئەمن لە گوڵەسوورەکانی دارە پیرۆزەکە دەخوازم. کە ئەو گوندەی دارسپیدارەکەی لێیە بیسوتێنێ و کابرای خاوەن ئۆتۆمبێلیش بکوژێ.

- بۆ چما ئەو چی لەگەڵ ئێوە کردووە.؟

- هەزار جنێوو سووکایەتی پێکردین. ئاشق عەلی ئاشقێکی حەقیقییە، تەنانەت جنێوی بە گۆرانی و سازەکەشیدا.

ئەگەر ئەو دارهەنارە ئەوی نەکوژێ.. . ئەوا ئەمن دەیکوژم.. .

ئەحمەد بەسەریدا نەڕاند:

- بۆ مەگەر ئەتۆ شێت بووی؟

حەمە چکۆل لەڕاوێژی قسەکەی وی ڕا بۆی دەرکەوت وەسەرگولان پەڕیوە، بۆیە هەناسەیەکی هەلکێشاو گوتی:

- بەگاڵتەم بوو، دەنا ئەمن ئەوکابرایەو ئەوگوندەی چۆن دەبینمەوە.. . ئەتۆ دەتوانی شوێنی ئەو دارەمان بۆوەبینی.؟

- ئێستا ئێوە چەند ڕۆژێك لێرە وەمێنن وپشووبدەن، ئەمنیش دەپرسم، بزانم داری وا هەیە یان نا، ئەوکاتی.. .

حەمەچکۆل گوتی:

- پرسیارمەکە، هەیە. چمادەکرێ دارێکی وا نەبێ؟ ئەوژنەی کە لەچیای دوڵدووڵڕا هاتۆتە چوکوراوا بەنێمەی گوت.

- ئەگەر دارێکی وا هەبێ ئەمن حەتمەن شوێنەکەتان بۆ دەبینمەوە.

بیبەری سوورو بامیەو باینجانی بە بەنیەوە کردبوو، بەن بەن بەساباتەکەی هەڵواسیبوو. حەمە چکۆل بەدەورروبەری ساباتەکەدا دەگەڕاو هەموو شتێکی بە سەرنجەوە تەماشادەکرد، تەنانەت مێروولەو جروجانەوەریش.

لەو سەرەوە دەچووە ئەو سەری بێستانەکەو شووتی و کاڵەك و کولەکەو هاروێ و گوڵەتەماتەکانی بە وردییەوە دەپشکنی. پەپوولەی گەورەی شین و نارنجی و کەسك و سپی بەسەر بێستانەکەدا هەڵدەسووڕان.

شووتی گەورە گەورە لە پەنا بڕکەکان لەسەر خاکە کێڵدراوەکە مۆڵ ببوون.

حەمە چکۆل شەش هێلانەی باڵندەی لە تەنیشت یەکەوە دیتنەوە. هەر هێلانەیەك سێ هێلکەی خاڵداری تێدابوون.

بەڵام نەدەزانرا باڵندەکان بۆ کوێ چوون. هێلانەکانیش نەیانتوانی سەرنجی ڕاکێشن. بۆ خۆشی نەیدەزانی بۆ واپەرێشانە. پەرێشانییەك کە وەگریانی دەخست و ئارام و ئۆقرەی لەبەر بڕیبوو و ڕزگاربوونی نەبوو. لەدوای ئەوە چۆن دەیتوانی تەماشای ڕوخساری ئەو ئاشق عەلییە بکا، ئەو ئاشقێکی حەقیقی بوو، چۆن دەیتوانی تەماشای ئەو حەمەدە زلەیەی بکا. چۆن دەیتوانی تەماشای ئەو هۆسۆکە شێتەو ئەو وسووە مردولەی بکا؟ لە هەموو شتێك، لەو نانەی کە دەیخوارد. لەو ئاوەی کە دەیخواردەوە. لەو پەپوولانە، لەو باڵندەو گیانلەبەرانە شەرمی دەکرد. نەیدەتوانی بگەڕێتەوەو تەماشای ئەو گوندەی بکا، کە دارسپیدارەکەی لێبوو.

ئەحمەد ئاگردانەکەی هەلکرد. باینجان و تەماتەو کدوو بیبەرەکانی ورد کردو بامیەکانی سەروقوون کردن و پیازەکانی ئەنجنین و مەنجەڵە ڕەشەکەی لەسەر ئاورگەکە داناو ئاورەکەی خۆش کرد. ئەوانی دیکەش هەستانەسەرپێ. گەرمایەکە کەم ببۆوە. لەلای باشوورو لەسەر دەریای سپی، پارچە هەورەکان لێك خڕببوونەوەو لەخوارێش گێژەڵووکە بەرەو ئاسمان هەڵدەچوون. فێنکایەتی بەرە بەرە دەشتەکەی دادەگرت. ئاشق عەلی لەپێشەوەو لەدوای ویش هۆسۆك و حەمەدو وسوو چوونە نێو بێستانی. کاڵەك و شووتی و گوڵەکان هەموو شتێکیان بە سەرنجەوە تەماشاکرد. بەسەر سەریانەوە سێبەری هەورەکان بەرەو ڕۆژهەلات تێدەکشان. لە مەرەزەجاڕەکەی بەرامبەریان سەدان لەك لەك لەسەریەك لاق بە چاوەڕوانییەوە ڕاوەستابوون. حەمە چکۆل لە جۆگاکە پەڕییەوەو بەرەو غاباتەکەی دەوروبەری باتلاغەکەی (ئاکچاساز) دەڕۆیشت.

هۆسۆك بە تووڕەییەوە گوتی:

- ئەو توتکە سەگە بۆکوێ دەڕوا؟

حەمەد گوتی:

- بچێتە هەر جێگایەکی دەگەڕێتەوە.

ئاشق عەلی پێکەنینێکی تاڵی کردو گوتی:

- زۆر سەیر دێتە بەرچاو. بنیادەم بوونەوەرێکی پڕ لەنهێنییە. ئەگەر پێشتر پێیان گوتبام کوڕەکە ئەو حاڵ و وەزعەی هەیە باوەڕم نەدەکرد. ڕاستیان گوتووە، کە دەڵێن: (گندۆرە بە ڕەنگی نییە) ئەو بنیادەمە بوونەوەرێکی سەیرە.. .

حەمەد پرسی:

- بۆ حەمە چکۆل چییەتی؟

ئاشق عەلی بە نێوچاوان گرژییەوە گوتی:

- هیچی نییە، هیچی نییە، هیچی بەسەرنەهاتووە. بەلاّم ئەمن پێم وایە وەزعی تەواو نییە، هاوڕێیان.

- بۆچی بەسەرهاتووە.؟

- ئەمن زۆر لەحاڵ و وەزعی نیگەرانم هۆسۆك. هەر لەدوای ئەو دێیەی کەسپیدارەکەی لێبوو.. .

هۆسۆك گوتی:

ئەمن هیچی لیّ حالّی نەبووم.
ئاشق عەلی بە توندییەوە گوتی:
- سەرەنجام لێی حالّی دەبی.
لەناکاو گفتوگۆیان پچڕا. بەسەر پۆلە پەڕەسێلکەیەکی زۆر داکەوتن کە لەخواریّ هەلّلاّو هەنگامەیەکیان بەرپاکردبوو، کە هێندەی نەمابوو خۆیان دەسەرو چاوان بکوتن. هەتا ئێستا ئەوەندە پەڕەسێلکەیان بەیەکەوە نەدیتبوو و نەشیان بیستبوو.
پەڕەسێلکەکان بە تەنیشت یەکەوە بە هەر چوار دەوری کێلّگەکەدا دەسووڕانەوە. لەسەر بێستانەکە کۆدەبوونەوەو قیامەتێکیان بەرپادەکرد. ئاشق عەلی سەری سووڕمابوو لەوەی دەیدیت هەزاران پەڕەسێلکە وەکوگلۆلّە لێك خڕدەبوونەوەو بەبیّ ئەوەی وێککەون لەو سەرەوە بۆ ئەو سەری دەخزین.. . لە دلّی خۆیدا دەیگوت: ( چۆن ئاوا بەتەنیشت یەکەوە هەلّدەفڕن وێکناکەون؟) لەبن لێوانەوە گوتی:
-ئەوە حیکمەتی خودایە.
سەریان هەلّێنا گوتیان حەمە چکۆل گەڕاوەتەوەو خەریکە بەرەو لایان دێت.
-دەبیّ دارهەناری سەر گردەکە وەبینین. چونکە حالّ و وەزعی ئەو کوڕەی باش نییە. حالّەتێکی ترسناکی هەیە.
شووتی و کالّەکی کڕك گولّەکەکانیان و جووچکە هەوێردە و ئەو جڕو جانەوەرەی بەسەر چلّەکانەوە بوون مارمێلکەی سەوز و ئەو خاکە رەشە کە وەکو بڕوێشی تەڕ کراو نەرم بوو. سەدان شووتی و کالّەکی رووشە و ڕەش و زەرد لەسەر عەرزیّ مۆلّ ببوون. . .
تا ئێوارەیەکی درەنگ بەنێو بێستانێدا گەڕان. کەمێك دوور لەساباتەکە جارجار هەندێك بلّێسە لەژێر قابلّەمەکە دەهاتنە دەریّ و پاشان دەچوونەوە ژووریّ. ئاشق عەلی گەڕایەوەو تەماشایەکی هاوڕێکانی کرد و گوتی:
-دەبیّ بەیانی وەڕیّ کەوین. ئەو بێستانەوانە بە هیچ شێوەیەك پێی خۆش نییە لێرە بڕۆین. . . ئەگەر ئەو هاوینەی لێرە وەمێنین و هیچ کارێکیش نەکەین بەستەزمانە لەخۆشیان شێت دەبێت.
حەمەد گووتی:
- ئێمەی کەوتۆتە بەر دلّی.
ئاشق عەلی پێکەنی:

- چۆن بتوانین خۆمان لەدەست ئەو پیاوە چاکەی رزگاربکەین. دەبێ بڵێین چی؟

هۆسۆك گوتی:

- دەبێ برۆین. ئێمە کارمان هەیە. دەبێ بەدوای دار هەنارەکەدا بگەڕێین.

حەمەد گووتی:

- وەدوای دار هەنارەکە. . .

هۆسۆك گووتی:

- دار هەنارەکە دەبێ لەو دەوروبەرانە بێت.

حەمەد:

- ئەو ژنەی خەڵکی چیای دووڵدووڵ بوو ئێرەی پێ نیشان داین. دیارە دەبێ لەو دەورانە بێت.

لەلای خواریێ ئاناوارزا و قەڵای دوملوو قەڵای یەیلان و لەلای سەرێش تۆپراك قەڵا و قەڵای حەمیدیە بەسەر دەشتە کاکی بەکاکییەکەیان دەڕوانی. دوای ماوەیەك حەمە چکۆل گەیشتە لایان. وسوو بەهیچ شێوەیە خۆی تێکەڵی قسەکانیان نەدەکرد و چاوە تێکچرژاو و ریشە رەق و درێژەکەی خۆی دەخوراند و بیری دەکردەوە. لە ڕووخساریڕا دیار بوو نووقمی خەیاڵە. کەوتبووە جیهانی خۆی و کەس نەیدەزانی بیر لەچی دەکاتەوە. ئەوانی دیکە بەرەو ساباتەکە وەرێ کەوتن و وسووش لەکاتێکدا هەروا ریشەکەی دەخوراند لە ناوەڕاستی کێڵگەکە بەجێ ما. سێبەرەکەی زۆر بەرەو لای رۆژهەڵات درێژببۆوە: (دارهەنارەکە زۆر بەرز بوو، بە بەرزی سوورە چنارێك. وەکو دارە گوێزە پیرۆزەکەی (دیکنلی) ئەستوور بوو، لك و پۆپەکانی هەر چوار دەوری گردەکەی داپۆشیبوو. کانییەك لەبنی هەڵدەقوڵی، کە ئاوەکەی وەقەدی درەختەکە دەکەوت و بەرز دەبۆوە. کەفێکی سپی نوورانی بە دەوروبەریدا دەپڕا. تەواوی گردەکە لەژێر سێبەری درەختەکەدا بە تەواوی فێنك بوو. لەکاتێکدا دەوروبەری گردەکە لەژێر گەرمادا دەسووتا. لەبن دار هەنارەکە شنە بایەکی فێنکی لێدەهات. گوڵە وەنەوشە سەرتاسەری گردەکەی داپۆشیبوو. ڕاست لەبن درەختەکە بەردێکی مەڕمەڕی سپی لێدانرابوو. لەدیوێکی خەت و نیشانەیەکی سەیری لێبوو، دیوەکەی دیکەشی سەری ژنێکی لێهەڵکەنرابوو، چاوی گەورە و لێوی ئەستوور و پرچێکی درێژی هەبوو، کە لە ملی ئاڵابوو. زۆر جوان نەخشێنرابوو. لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا یەك پارچە گوڵی هەنارەکە دەپشکووتن و ڕەنگە سوورەکەیان لە ئاوەکەدا ڕەنگی دەدایەوە. ئاوەکە دەڕۆیشت سەرتاسەری دەشتەکە پڕ

بوو لەگیای وشك و گوڵە هێرۆی پەمەیی و لاسکە گەنمی بریقەداری درواوەو شاخی شین و چۆمی جەیهان، وردە بەردی سپی کە لە دەوروبەری بڵاوببوونەوە، پۆلە دڕووی کێوی و قامیش و مەرەزجاڕی سەر سەوز لەڕەنگی گوڵە هەنارەکەدا نقووم دەبوون. ئەو سوورایییەی کە لە دارهەنارەکە بەدەشتەکەدا بڵاو دەبۆوە. لەحزەیەك لەسەرتاسەری دەشتەکەدا دەتروسکایەوەو پاشان دەبوو بەگڵۆڵەیەك و بە شاخەکانی تووڕوسدا هەڵدەکشا و لەچاو ون دەبوون. ئەو دارە پیرۆز و بە شکۆیە لەمەککەی پیرۆزەوە هێنابوویان. کاتێك حەزرەتی عەلی هاتۆتە چوکوراواو شمشێرەکەی لەشاخی ئاناوارزادا، لەگەڵ یەکەم شمشێر کێوەکە دوو لەت بوو، سەری بەرەو لای ڕاست وەرسووڕاند و ئەو دار هەنارەی چاو پێکەوت. حەزرەت لە تەمەنی خۆیدا گوڵە هەناری ئاوا جوانی نەدیتبوو، نە داری ئاوا سەر سەوز و هەر گەڵایەی بە جۆرێك دەدرەوشایەوە. چووە پەنا دارەکە کە نوقمی نووری سەوز بوو، پاشان دەستی بەسەر یەك بە یەکی گەڵایەکاندا هێنا و گوتی: (ئەی داری پیرۆز. ئەتۆ برۆ سەر ئەو گردە بە ئەمری خودای گەورە ئەوێ جێگای تۆیە، لەوێ سەوز بە. لەوێ دەرمانی دەردەداران و ئومێدی بێ ئەومێدان بە. . . ) دار هەنارەکەش چوو لەسەر گردەکە ڕاوەستا و ڕەگەکانی بەناخی ئەرزەکەدا بردە خوارێ و لەهەمان کاتدا لەژێرخاکەکە ئاوێکی ڕوون و زوڵاڵ وەکو نوور هەڵڕژا و بەسەر وردە بەردەکاندا بڵاو بۆوە. هەرکەسێك لەو ئاوەی بخواتەوە نەخۆش و دەردەدار نابێ. تەنانەت تەپۆش ناتوانن نەك لەدرەختەکە، بەڵکو لەگردەکەش نزیك ببنەوە. . .

لەکاتێکدا تەپۆو مێشوولە لەزەوی و ئاسمان دەبارن. یەك تەپۆ، لەدارهەنارەکە هیچ، ناتوانن لەگردەکەش نزیك ببنەوە. مارو دووپشکە و مێروو جڕوجانەوەریش ناتوانن لەگردە نزیك ببنەوە. پیاو کوژو دزو زۆردارەکانیش ناتوانن لەگردەکان نزیك ببنەوە. هەرکەسێك سێ ڕۆژان لەبن ئەو دارەی بنوێ، وا ساغ دەبێتەوە دەڵێی تازە لەدایك بووە. پۆلە گوڵە وەنەوشەی شین لەلێواری ئاوەکە و لەسەر وردە بەردە سپییەکە. . . لە قوڵایی ئاوەکەدا بریسکە و نوور لەسەر وردە بەردەکان هەڵدەقوڵێن. . . هەموو شەوێ کارمامزەکان بەبێ ئەوەی کەس چاوی پێیان کەوێ لە چیای ڕا دێنەخوارێ و دێنە بن دارهەنارەکە و لەدەوری خڕدەبنەوە و وەکو بڵێسەی ئاور تا لەچاوان ون دەبن هەڵدەسووڕێن. . . وسوو بەنێو مێگەلە کارمامزەکەدا ڕۆیشتەوە کن ساباتەکە. بۆنی خۆشی ڕۆنەکەرەی هەڵقرچاو، کە بەسەر پلاو بروێشەکەیان دا کردبوو بۆنی تەماتە سوورکراوەکە، کە لەسەر ئاورەکە دەکوڵی هاتە بەر لووتی ڕوخساری وسوو نوقمی خەون و خەیاڵ ببوو و گەنج ببۆوە.

هۆسۆك گووتی:

- چیتە وسوو؟ نێوچەوانت گەشە چی ڕووی داوە؟

ئاشق عەلی پێکەنی و گووتی:

- بۆنی پلاو برِوێشی بۆهاتووە بۆ دەتەوێ چ رووب دا؟

وسوو:

- بالێرە برۆین. برِۆین و ئەو دارهەنارەی وەبینین.

ئاشق عەلی گووتی:

- زۆر باشە، دەرِۆین بەلاّم درەختەکە لەکوێیە؟ جێگاکەمان پێ نیشان بدە تا برِۆین وەیبینین.

حەمەد گووتی:

- جێگاکەی ئەحمەدی بێستاوانەوان پێی دەزانێ، ئەو پێمان دەڵێت.

ئەحمەد گووتی:

- ئەمن پێی نازانم. بەلاّم بەیانی (مام حەسەن) دێتە ئێرە، ئەو کەسێکە لەو چوکوراوایەی هەرچی دارو گولّ و گیا و ڕەگ هەیە دەیناسێت. هەرچی ناوی شیفابەخش و هەرچی ئەشکەوت و جرِوجانەوەر و باڵندە هەیە دەیناسێت.

ئاشق عەلی گووتی:

- کەواتە بڵێ لوقمانی حەکیمی ئەو زەمانەیە.

- پەنجا ساڵە گیای شیفابەخش کۆدەکاتەوە. ڕاست پەنجا ساڵە. . . ئەو هەموو کێو و بەندەنانە، چیاکانی تورِووس، ئەو خوارە لای کێوی نوور، دۆڵ بەدۆڵ و بەرد بەبەرد و کانی بە کانی شارەزایە. لە لوقمانی حەکیمیش زیرەکترە، زوڵمێ لەکەس ناکات. بەلاّم ئەویش وەکو لوقمانی حەکیم بە دوای دەرمانی مەرگدا دەگەرِێت. هەر پانزە رۆژان جارێکی یان مانگی جارێکی دێت و سەرم لێدەدات. لەنێو بێستانی گوڵێکی سووری لاسك بڵندی لێ دەروێ دەڵێی چرایە دایسێ. مام حەسەن بۆ چنینی ئەو گوڵەی دێتە ئێرە کاتێك ئەو گوڵەی نابینێ، ئەو کات وەردو تەماشای روخساری مام حەسەنی بکە یەك پارچە غەم و پەژارەیە.

ئاشق عەلی گووتی:

- زۆر ڕاستە، قەدری گوڵ هەر مێش هەنگوینە دەیزانێ، نەك هەموو مێشێك.

- ئێستا وەرە ئەو گوڵەی ببینە لێرەیە. بڕوانە گەورە بووە و هەڵکشیوە. کاتێ مام حەسەن چاوی پێکەوێ لەخۆشیان شێت دەبێ و لەپێستی خۆیدا جێی نابێتەوە. بەو سن وساڵەی خۆیەوە بە دەوری گوڵەکەدا هەڵدەسوڕێت، سەما دەکا و پێدەکەنێ. ئەگەر سبەینێ نەیەت حەتمەن دوو سبەی دێت. کاتی پشکووتنی گوڵەکە، تەنانەت کاتژمێر و چرکەکەشی دەزانێت.

- زۆر ڕاستە ئەوانە دەیزانن.

- ئەگەر لەو دەشتەی یا لەو سەرەوەی لە چیاکانی تورووس، یان لەو خوارەی لەلای کێوی نوور، یان لەو لایەی لەلای کێوی گاور، یا لەو دەریا شینە و لەژێر ئەو هەورە سپیانە کە لەو دوورەی کۆبوونەوەو بەرەو ئێرە دێن. یان لەهەر گوند و لەبن هەر بەردێك و لەسەر هەر کانییەکی ئەو دارەی، کە ئێوە باسی دەکەن هەبێت، شوێنەکەی مام حەسەن پێی دەزانێت.

ئاشق عەلی گوتی:

- ڕاستە پێی دەزانێت .

- بۆیە دەبێت هەتا ئەو دێت ئێوە لێرە وەمێنن.

- ئاخ، خۆزگە لێرە کارێکمان دەست دەکەوت. . .

ئەحمەدی بێستانەوان گوتی:

- بریا دەست کەوتبایە. بەڵام لێی نییە. لەو وەرزەیدا لە بێستانی چ کارێك پەیدا دەبێت. تەنها ڕنینەوەی شووتی و کاڵەکە. ئەویش بە شەش کەسان هەتا نیوەڕۆ خەلاس دەبێت، سەرەڕای ئەوەش پارەشم نییە کرێکاری پێ بگرم ئەمن بۆ خۆم لێرە. . .

تەواوی نەکردو گوتی:

- فەرموون بۆ سەر سفرەی.

چێشتەکە لە چێشتی نیوەڕۆ بەتامتر بوو. کوێستانییەکان دووبارە هێرشیان بردەوە سەر سفرەی.

دوای نان خواردن ئەحمەد ئەو شووتی و کاڵەکانەی لێی کردبوونەوە و لە چاڵاوەکەی هاویشتبوون تا فێنك ببنەوە، هێنانییە دەرێ و قاشی کردن. شووتییەکان توورت و وەکو خوێن سوور بوون. کاڵەکەکانیش وەکو ڕۆژێ زەرد بوون.

لای نوێژی شێوان ئەحمەد گووتی:

- ئێمە لێرە لەدەستی تەپۆیان ناتوانین بنویین.

ئاشق عەلی پرسی:

- چی بکەین؟

هۆسۆك گووتی:

- ئاوری دەکەینەوە. ئێمە هەمیشە ئاور دەکەینەوەو لە پەنا دووکەڵەکەی دەنووین.

- چما بەم شێوەیە لەدەست تەپۆیان رزگارتان دەبێت؟

ئەحمەد بەخۆشحاڵییەوە پێکەنی و گوتی:

- ئەمن پەردە کوللەیەکی گەورەم هەیە. لێرە لەناو پەردە کوللەکەدا.. . چەند رۆژان بتانەوێ دەتوانن چاوەڕوانی مام حەسەنی بن. بڕوانن گوڵە سوورەکەی گەورە بووە. ئەو هەر چونێك بێت دەزانیێ،کە گوڵەکەی گەورە بووەو هەر لەگەڵ پشکوتنی پەیدا دەبێت. نەزەرکردەیە بۆ دەردی ئێوەش دەرمان پەیدا دەکات.

حەمە چکۆل گوتی:

- ڕاستە.

ڕۆژ ئاوابوو شەوداهات. تەپۆ وەکو پەڵەهەور هێرشیان کردنەسەر.

بێستانەوان گوتی:

- پەردەکوللە.

وسوو گوتی:

- کوڕە کونی دەکەن. درێشوکەیان وەکو نێزە تیژە.

حەمەد بەپێکەنینەوە گوتی:

- ئێسکیان هەیە.

ئاشق عەلی گوتی:

- پڵنگی تورووس و تەپۆی چوکوراوا.

هۆسۆك گوتی:

- ئەوە لەویش خەراپترە.

پەردەکوللەکانیان لەسەر ساباتەکە هێناخوارێ. پەردە کوللەکە لەڕاستیدا زۆر گەورەبوو، هەموو جێی خۆیان کردەوە. لەدەرێ تەپۆ وزەوزیان دەکردو وەکو هەور هەر چوار دەوری پەردەکوللەکەیان گرتبوو.

-ئێستا ئەگەر لەدەرێ ئەسپێك، گایەك، گورگێك، یان پلنگێکی لێبێ. تەپۆ تەواوی لەشیان داپۆشیوەو شەلاڵی خوێنیان کردووە.

لەبەرئەوەی سەریان وەسەر باقە گیایان کردبوو، لەژێر گەرمایەکی توندا بەبێ دەنگی خەویان لێکەوت.

لێرە لەنێو بێستانەکە ڕۆژیان تێدەپەڕاندو چاوەڕوانی حەسەنی گیاناسیان دەکرد.

ئەحمەدی بێستانەوانیش لەخۆشی میوانەکانی گەلێك دڵشادبوو. لەترسی ئەوەی کە حەسەنی گیاناس پەیدابێ ومیوانەکانی دەڕۆن، نەیدەتوانی تەماشای لای (ئەلی کەسیك) ی ئاناوارزا بکاو لەهاتنی ئاگاداربێ.

وسوو سێ ڕۆژان لەسەریەك لای نیوەڕۆیە نۆبەتێی دەهاتێ. وەك شێتان لە گەرمان سووتاو لەسەرمان چۆقەچۆقی هاتێ و ددانی لەچیڕەوە دەبردن. ئەحمەدی بێستانەوان کە لە هاتنی وان گەلێك خۆش حاڵ بوو، لەو سێ ڕۆژانە لەهیچ هەوڵ و کۆششێك درێغی نەکرد. حازربوو لەپێناوی وسوویدا گیانی خۆیشی بەخت بکا. ( ئەی بریا لەو بێستانەی بۆ ئەو کوێستانیانە کارێك پەیدادەبوو، ئەوکاتی هەتا پایزێ لێرە کاریان دەکردو پاشان بە گیرفانی پڕەوە دەگەڕانەوە گوندەکەیان.. . )

لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا ئەحمەدی بێستانەوان لە هەموو نهێنییەکی ژیانیان حاڵی ببوو. لە قوربانیکردنی گا زەرد. لە فرۆشتنی بزنەکورێ، لە بەکەم گرتن و گوێ پێنەدانی ئاغاژنێ. لە هێزی بێ حەددو بێسنووری دارهەناری سەرگردەکە.. .

پاشانیش هەموو ڕۆژێ کە ڕۆژ ئاوادەبوو، ئاشق عەلی بەسەر سازەکەیدا شۆڕدەبۆوەو بەودەنگە بەسۆزەی کەتا قولایی ناخی بنیادەم دەچووە خوارێ و وای ئینسان دەهەژاند، دەتگوت نۆبەتێی لێیە، تێی هەڵدەکرد. لەبارەی چوکوراواو ئینسانە زۆردارەکان و هێرشی بێ نامانی تەپۆو ئەو گەرمایەی کە ئێسکی لەشی بنیادەمی دەتواندەوە، گۆرانی وای دەگوت کەس نەیبیستبوو، چاویشی هەر لەرێی (ئەلی کەسیك) بوو، داخوا کەنگێ حەسەنی گیاناس پەیدادەبێ.

سیوادی دابوو، لوتکە چیای گاور بەرە بەرە ڕووناك دەبۆوە. سەرتاپای کێوی دووڵدووڵ یەك پارچە لەلافاوی نووردا نقوم ببوو، مژێکی خۆڵەمێشی مەیلەو سووری لێ هەڵدەستا. لەو بەینەدا حەسەنی گیاناس بە توربێنێکی گەورەوە کە بە کۆڵێی دادابوو، هاواری دەکرد: (

ئەحمەد.. . ئەحمەد.. کوڕم ئەحمەدی بێستانەوان) لەپشت پۆلە دڕوییەکەوە دەرکەوت. ئەحمەد ڕەنگی ڕوخساری سپی هەڵگەڕاو بەنووزە نووزەوە گوتی:

-هات، ئەواهات، حەسەنی گیاناس.

هەموویان هەر یەکەو لەلایەکەوە بەخۆشحاڵییەوە بەرەو پیری چوون. حەسەنی گیاناس پیاوێکی باریك و ڕەقەڵەبوو، کەمێك کۆم ببۆوەو بە هەنگاوی درێژ دەهاتە پێش و لە چاوتروکانێکدا خۆی گەیاندنێ.

ڕیشە تەنك و سپی و بێگەردەکەی دەگەیشتە سەرسنگی و دەبریسکایەوە. دەم و چاوو ملی پرگنج و لۆنج بوون دەتگوت تەونی جاڵجاڵۆکەیە. چاوە سەوزو بە قووڵداچووەکانی وەکو دووخاڵی نور دەچوون. بێ پسانەوە بەهەموو ڕوخسارییەوە پێدەکەنی. هەر کەسێك چاوی پێدەکەوت وای دەزانی ئەو دنیایە هیچ خەم و خەفەتێکی تێدا نییە.

- گوڵەکانی من پشکووتوون. وەکو گڕی ئاگرن! لەکاتی خۆیدا هاتووم. من کاتەکەی دەزانم. ئەمن دەزانم لەو دنیایەیدا چ گوڵێك لەکوێ و لەچ کاتێکدا دەپشکوێن.. . باب و باپیرم و بابە گەورەشم دەیانزانی. خوداوەند وەچەی ئێمەی بۆیە خوڵقاندووە، کە لوقمانی حەکیمی هەمووگوڵەکان بین. هەمووگوڵ و گیاو درەخت و هەموو باڵندەو پێڕۆیەك.. . لەو دنیایەیدا هەر کەسەو هونەرێکی هەیە. هونەری ئێمەش ئەوەیە.

ئەو حەسەنی گیاناسە کە لەوەچەی لوقمانی حەکیمەو شانازیشی پێوەدەکا، هەتا ئێستا نەماڵی کەسی خواردووەو نە نانی کەسیشی بڕیوە، نە زوڵمی لەکەس کردووەو نە سووکایەتیشی بە هیچ کەسێك کردووە. کاری ئەو بەرەبابەی لەزەمانی زۆر کۆنەوە هەر ئەوەبووە، لەو توڕووسە پان و بەرینە گیایان خڕکردۆتەوەو دەرمانی دەردەدارانیان لێ درووست کردووە.

حەسەنی گیاناس لە هەر شوێنێك و لەگەڵ هەرکەسێك بەرەو ڕوو بێ، دۆستانە خۆی نیشان دەداو تاریفی کارەکەی خۆی دەکات. حەسەن زۆر لەوکارەی خۆی ڕازییە.

کاتێك لەگەڵ ئەو پێنج کەسە ڕووبەڕووبوو، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، دەست بەجێ باسی پەنجاساڵەی کاری خۆی لەگوڵ و گیاکۆکردنەوە دەست پێکرد. ئەو لوقمانی سەردەمە، زمانی باڵندەو مێرووڵەو جرۆجانەوەرو زمانی گیاو درەخت و تەواوی گوڵەکان دەزانێ. هەروەها زمانی شاخ و زمانی ئاوو باو هەورانیش دەزانێ.

گوڵە سوورەکە، کەوەکو گڕی ئاگربوو، لێیکردەوەو هات. شەپۆلی شادی تەواوی لەشی گرتبوو.

-تەماشای ئەو گوڵەی کەن. ئەو گوڵە سوورە لە شەوی تاریك و ئەنگوستەچاودا، وەکو پارچەیەك ئاگر دایسێ. ڕۆژەڕێیەك تروسکاییەکەی دەبینی. ئەو گوڵەی دەبینن خوا دەزانێ چەند کەسان لە دەردەداری و نەخۆشی ڕزگاردەکات.

ئەو گوڵەی کە دەیبینن.. . . .

ئاشق عەلی هێدی هێدی لەو پیاوەی کە نوقمی شادی بوو، لێی نزیك کەوتەوەو سەرەنجام لە پەنای ڕاوەستاو بەدەنگێکی نوساوەوە گوتی:

-مام حەسەن زۆر لەمێژە چاوەڕوانی تۆین. زۆر شوکر بۆ خوا کە هاتی.

چاوە پڕشنگدارەکانی بریسکانەوەو گوتی:

-بەڵێ سەرەنجام ئەوا هاتین. ئێوە پێویستیتان بە داوو دەرمانە.؟

ئاشق عەلی غیرەتی بزووت و گوتی:

- بەڵێ.

حەسەنی گیاناس پێکەنی و گوتی:

-دە بڵێ.

ئاشق عەلی دوای ئەوەی یەك دوو جار تفی زاری قووت دایەوە، دەتگوت دەیەوێ خۆی بۆ سازلێدان و گۆرانی گوتن ئامادە دەکات، خۆی کۆکردەوەو گوتی:

-گۆیا لێرە لەسەرگردێك دارهەنارێك هەیە.

بێدەنگ بوو. حەسەنی گیاناس برووسکە پۆلاینەکەی چاوانی تێوەبڕی و نێوچاوانی تێك ناو چاوەڕوان ما.

ئاشق عەلی دەتگوت دەترسێ وشەیەك لە زاری دەرپەڕێ، بەپەلە درێژەی پێدا:

-ئەو درەختە دەرمانی گرانەتاو نۆبەتێیانە. دەمانەوێ وسووی بەرینە وێ. ئەو وسووەی کە دەیبینی. بەدەست وسووی نیشان دا.

-نۆبەتێ برستی لێبڕیوە. ئەگەر ئەو دار هەنارەی نەبینینەوە وسوو دەمرێ.. .

حەمەد خۆی دە نێو قسەکانی هاویشت و گوتی:

-دەمرێ.. . بەداخەوە! وسوو پیاوێکی زۆر باشە. خۆزگە بتوانین درەختەکە وەبینین.

حەسەنی گیاناس پرسی:

-ئێوە باسی چی دەکەن؟
-دەڵێن تەنیا ئەتۆ بە شوێنەکەی دەزانی. لە خاکی چوکوراواو کێوەکانی توڕووسدا، کەسێك نییە وەکو تۆ،کە جێگای درەختەکان پێبزانێت.
دەماری ئەو پیاوە لەخۆڕازی بووەیان دیتبۆوە، بۆیە پێیان لێدەچەقاند:
-ئەتۆ ڕەگی هەموو گیایەکی دەناسی و زمانەکەشی دەزانی، ئەتۆ تەنانەت لەهاتووچۆی مێروانیش سەردەردەکەی.
-ئەمن نازانم ئێوە باسی چی دەکەن؟
-تەنیا ئەتۆ دەزانی مام حەسەن، حاڵ و وەزعی ئێمە خراپە. ئەگەر ئەو دارەی نەبینینەوە لەبەین دەچین.
ئامان مام حەسەن، تەنیا ئەتۆ دەزانی شوێنی ئەودارەمان پێبڵێی.. .
-ئێمە جیا لەودارهەناره، هیچ هیواو ئومێدێکی دیکەمان نییە.
-وسوو نەخۆشە.
-ئێمەش پەرێشان و لێقەوماوین.
-دوو سێ مانگە لەو چوکوراوایەی سەرگەردانین. دەستەوەستان بووین.
-دەستەوەستان بووین و کاریشمان دەستنەکەوت.
-ئەگەر ئەو دارەی وەبینین و شەوێکی لێی میوان بین، لە هەموو خەم و خەفەتێك نەجاتمان دەبێت.
-کێ ئەوێی پێگوتوون.؟
-هەموو کەس! لەچوکوراوا هەموو کەس دەربارەی ئەو درەختە قسەی لەگەڵ کردووین.
-بە ئێمەیان گوتووە ئەگەر ئەو درەختەی نەبیننەوە، ڕزگاربوونتان مەحاڵە.
-چ کەسێك پێی گوتن؟
-ئەو ژنەی کەخەڵکی چیای دووڵدووڵەو لەو گوندە پڕ لە درەختە دەژی.
-گوتی تەنیا ئەو دارە دەتوانێ یارمەتیتان بدات.
-ئەگەر هەرکەسێك لەو چووکوراوایەی لەبن ئەو دارەی نەنوێ، نەجات بوونی نییە.
حەسەنی گیاناس بە ڕووخۆشی و دڵسۆزییەوە تەماشایەکی کردن و پێکەنی و بە دڵنیاییەوە گوتی:
-لە چوکوراوا درەختێکی ئاوا پیرۆزی لێ نییە.

پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

-ئاخ بریا لێی بایە.

ئاشق عەلی بە ڕاوێژێکی پتەوەوە گوتی:

-لێیەتی. لێیەتی.؟

حەمەد:

-لێیەتی.؟

وسوو:

-لێی هەیە!

هۆسۆک:

-ناکرێ لێی نەبێ. ئەتۆ بە جێگاکەی نازانی و دەڵێی درەختێکی ئاوا وجودی نییە. !

حەسەنی گیاناس بە کەللە ڕەقییەوە گوتی:

-لێی نییە. ئەگەر درەختێکی ئاوا هەبایە، حەتمەن بە جێگاکەیم دەزانی.

ئاشق عەلی:

-پێی نازانی.

هۆسۆک نەڕاندی:

-پێی نازانی.

حەسەنی گیاناسیش هەڵچووبوو نەڕاندی:

-شارەزام.

ئاشق عەلی بە تووڕەییەوە گوتی:

-ئەگەر شارەزای دە پێمان بڵێ.

-درەختێکی بەو ناوو نیشانە نییە. دەنا ئەمن پێم دەزانی.

-هەیە.

ئەحمەدی بێستانەوان کەوتە نێوانیان و هێوری کردنەوەو هێنانییە بن سێبەرێ. ئەو شووتیانەی کە لە چاڵەکە دەری هێنابوون، لەپێشی دانان. دنیا بەرە بەرە ڕووناک دەبوو.

-فەرموون. !

دەستیان کرد بە شووتی خواردن. حەسەنی گیاناس، کە کەمێک هێوربببووەوە گوتی:

-هەبوو. لەچوکوراوا درەختی زۆر پیرۆزی لێ بوون. لێرەڕا تا دەگاتە دەریا پڕبوو لە درەختی هەنار. لەسەردتای هاوینێ گوڵە سوورەکان دەپشکووتن. خاکەکە لێردوە تا(ئایاس) وەکو دەریایەکی سوور شەپۆلی دەدا. ئەو ڕەش مارانەی کە دەتگوت ئاسنی سوورەوە بوون، لەژێر دارهەنارە پڕ لە گوڵەکاندا جووت دەبوون. تازە لەو دەشتە دارێکی بە پێوەی لێنەماوە. هەموویان لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەندن. ئێستا نە دارهەناری لێ ماوە، نە داربەڕوو نە سنەوبەرو نە تەماتە کێویلە. ئەو دەشتە هیچ شتێکی پیرۆزی لێنەماوە، تا دارهەنارە پیرۆزەکەی لێ مابێ. لەڕاستیدا لە پێشداش دارهەنارێکی بەو شێوەیەی هەر لێنەبووە.

هەموو شتێکی چاك و جوان و هەموو شتێکی ئینسانی کە هەبوو، بارگەوبنەی پێچایەوەو ڕۆیشت.

ئەگەر درەختێکی بەو شێوەیەی لێ بایە، زۆر لەمێژبوو ڕەگ و گەڵاو لکەکانی خۆی خڕدەکردەوەو لێرە دەڕۆیشت و دەچووە جێگایەکی دیکە. درەختێکی بەو جۆرەی ئێوە دەیڵێن لێی نییە. ئەگەر لێشی بێت ناتوانێت ببێتە دەرمانی دەردەداران. ناتوانێ کارێك بۆ ئێوە بکات.

ئاشق عەلی بە توڕەییەوە گوتی:

-ئەو دارە هەیە.

حەمەد گوتی:

-دەردی ئێمەش دەرمان دەکات.

وسوو گوتی:

-هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە.

-ئەگەر ئەو دارە نەمابێ ماڵ وێران دەبین.

ئاشق عەلی لەشوێنی خۆی دەرپەڕی و گوتی:

-یاڵڵا هەستن، دەرمانی ڕێیە ڕۆیشتنە. ئێمە بۆ خۆمان ئەو دارهەنارەی دەبینینەوە.

-شکی تێدا نییە ئەو دارهەنارە نەبێ.. . .

-لەسەر ئەو گردەی.. .

-لەسەر ئەو گردەی.. .

-بە گوڵی سوورەوە.

-ڕۆژە ڕێیەك گوڵە سوورەکانی وەکو ئاور دایسێن.. . .
-چۆن دەکرێ ئەو ژنەی کەخەڵکی دووڵدووڵە درۆمان لەگەڵ بکات.؟
-یان ئەو هەموو خەڵکی گەرمێن و کوێستانێ درۆمان لەگەڵ بکەن.؟
-دە پێم بڵێ چ قازانجێك لەو درۆیانەیان دەکەن.؟
-ئێمە ئەو دارەی دەبینینەوە.. .
-ئەو دارەی دەبینینەوەو بە ئامانجی خۆمان دەگەین.
لەگەڵ ئەوەی تووڕەش بوون بە ئەحمەدی بێستانەوانیان گوت:
-خواحافیز برا باشەکەمان.
-ئەو چاکەیەی تۆ لەگەڵ ئێمەت کرد، تەنانەت بابیشمان لەگەڵی نەکردووین.
-دنیا لە شەرافەتی ئەو ئینسانە باشانەیە کە خەرانابێ.
-خواحافیز.. .
خێرا بەنێو گژوگیاو چقڵە دڕکاوییەکاندا تێپەڕین، کە تا پشتێندێیان دەهاتن. بەرەو ڕۆژهەلأت و ڕووەو ئاناوارزا وەڕێکەوتن. ئەحمەدی بێستانەوان تا ئەوکاتەی لە چاوان ونبوون لەسەر پێیان ڕاوەستاو بەڕێیکردن.
پاشان بەخەمناکی و پەرێشانییەوە هات و لە پەنا حەسەنی گیاناس هەڵتروشکاو گوتی:
-ڕۆیشتن! ئاخ مخابن کارێکم پێشك نەهات بۆیان و بۆ خۆیشم کارم نەبوو بیاندەمێ.
حەسەنی گیاناس:
-بەستەزمانانە، لەهەموو لاوە تێماون. ئەو دارهەنارە.. . .
ئەحمەدی بێستانەوان بە دەستەپاچەییەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی:
-دەیبیننەوە، حەتمەن ئەو دارهەنارەی دەبیننەوە، دەنا چۆن دەتوانن بە دەستی بەتاڵەوە بچنەوە ماڵێ.
حەسەنی گیاناس لە نیگەرانی ئەحمەدی، ئەویش نەرم ببوو گوتی:
-خوا دەزانێ. لەوانەشە وەیبینن. بنیادەم موجیزەی زۆری لەبن سەری دایە.
بێستانەوان گوتی:
-موجیزەی زۆر.. . .
تازە زەردە لەسەرانی دابوو، کە گەیشتنە چۆمی (ساوروون) ئاوەکەی زۆر کەم ببوو، هەر بەقەدەر جۆگایەك دەبوو.

لەسەرچۆمەکە وەکو لەجۆگایەك بپەڕنەوە بازیان دا. کەمێك لەسەرووی خۆیان دێیەك بە خانووی لە خشت دروستکراو وەدەرکەوت.

هۆسۆك پێشنیاریکرد:

-با بڕۆین سەرێك لەو گوندەی بدەین.

ئاشق عەلی بەکەللە شەقییەوە گوتی:

-نا نابێ. هەتا دارهەنارەکە نەبینینەوە ناچینە هیچ گوندێك.

هۆسۆك بەناڕەحەتییەوە گوتی:

-ئەگەر نەچینە گوندان لەکوێڕا بزانین شوێنی دارهەنارەکە لەکوێیە.؟

حەمەد گوتی:

-دەیبینینەوە.

گەیشتنە سەرجادە، خۆڵەکە تا گوێزینگیان دەهات. هێشتا هەتاو داغی نەکردبوو. ئەو خۆڵەی دەچووە نێو کاڵەکانیان سارد بوور لاقی فێنك دەکردنەوە. لە بەرامبەریان تراکتۆرێکی ڕەنگ نارنجی دەرکەوت.

بە هێواشی بەرەو ڕوویان دەهات. کاتێك تراکتۆرەکە گەیشتە لایان بەر جادەبوون و ڕاوەستان.

ڕەنگی کڵاو گەڕگەڕییەکەی شۆفێرەکەش نارنجی بوو. شۆفێرەکە، کە گەیشتە لایان تراکتۆرەکەی ڕاگرت و گوتی:

-سڵاو کرێکارینە. حەتمەن لە کارەکەتان بوونەتەوەو دەتانەوێ بگەڕێنەوە.

هۆسۆك وڵامی دایەوە:

-دەمانەوێ بگەڕێینەوە.

چاوە ڕەشە گەورەکانی شۆفێرەکە خەم دایگرت:

-مخابن، ئەوساڵ لە چوکوراوا کار دەست نەکەوت. لەمەودواش دەستکەوتنی کار زۆر دژوارە.

هۆسۆك گوتی:

-زۆر دژوارە.

ئەو کاتەی شۆفێرەکە دەیویست تراکتۆرەکە لێبخوڕێ، ئاشق عەلی گوتی:

-ڕاوەستە.

شۆفیرەکە تەماشایەکی کردو گوتی:

تۆ خۆشخوانی؟ زۆر باشە فەرموو ئاشق دەتەوێ چی بپرسی؟

ئاشق گوتی:

-بەڵێ، دەمەویست بپرسم جێگای ئەو دارهەنارەی لەسەرگردە سپییەکەیە لەکوێیە؟

ڕوخسارە گەنم ڕەنگ و چەناگە قووڵەکەی لاوە شۆفێرەکە تێکچوو، چاوەکانی وێکهێنان و ماوەیەك لەگژ فکران ڕاچوو، سەرەنجام گوتی:

-ئەمن نە ئەوگردەم دیتووەو نە ئاگاشم لەو جۆرە دارەی هەیە. دەبێ ببووری.

تراکتۆرەکەی لێخوڕی و ڕۆیشت.

هۆسۆك لەپڕ وەکو شێتان تووڕەبوو ونەڕاندی:

-ئاخر پیاو شوێنی دارێکی ئاوا لە منداڵێکی وا دەپرسێ؟.. . .

حەمەد قسەکەی بۆ سەلماند:

-شوێنی دارهەنارێکی ئاوا.. . ئەویش لە مێردمنداڵێك.. . .

وسووش تووڕەبوو:

-ئەو شۆفێرە چۆن بزانێ! هێشتا منداڵە. ئەویش لە منداڵێکی ئاوا دەپرسێ.؟

حەمە چکۆل بێدەنگ بوو. لە بیرێکی قووڵدابوو. لە ڕوخساریدا هیچ شتێك نەدەخوێندرایەوە. ڕوخسای هیچ شتێکی نیشان نەدەدا.

ئاشق عەلی قسەکانی ئەوانی سەلماندو گوتی:

-ئەو کەسەی کە دەبوو پرسیاری لێبکەین، نەمانتوانی بە باشی هەڵی بژێرین. بەلاّم لە هەیکەلی ڕا وا دەردەکەوت کە کەسێکی باش بێت. ئەگەر شوێنی دارهەنارەکەی پێزانی با حەتمەن پێیدەگوتین.

هۆسۆك نەڕاندی:

-حەتمەن پێی نەدەزانی.

بە جادەیدا ئەسپ سوارێك تێپەڕی، پاشانیش داشقەیەك.. . سێ پیرەمێرد لەسەری سواربوون. بەدوای ئەوانیشدا ئۆتۆمبێلێك تێپەڕی، کە تەواوی لەشیانی لە تۆزێدا غەرق کرد. دوای ئەوانیش پیاوێکی تەقریبەن چل ساڵە، کە کلاّوێکی حەسیری لەسەرنابوو و کەواو پانتۆلێکی شینی تاریکی لەبەردابوو و پێلاّوێکی سپی لەپێدابوو، بە نارەنار بە خێرایی بە تەنیشتیاندا تێپەڕی. هیچیان ئەو کابرایەیان وەبەر دڵی نەکەوت.

لەو بارەوە پرسیاریان لە هیچ کەسێك نەکرد.

نیوەڕۆ هات، هەوا گەرم داهات. بە بێدەنگی بەرەو لای کێلگەیەك لێهالآن و خۆیان گەیاندە کەنار چۆمی ساورروون، چوون لەژێر کەندالێکی چۆمەکە دانیشتن. بووخچە نانەکەیان کردەوە، کە ئەحمەدی بێستانەوان بۆی پڕ کردبوون لە خواردەمەنی. ئاوی ساورروون مەیلەو زەردبوو، وەکو ئاوی حەمام گەرم بوو. هەرچۆنێك بوو لێیان خواردەوە، هەر لەوێ لێی درێژبوون، تا ڕۆژبا هەڵی کرد لێی نووستن.

لەپێشدا ئاشق عەلی وەخەبەر هات و دانیشت. لەدوای ئەویش ئەوانی دیکە هەستان. ماوەیەك هەروا بەبێ جوولە تەماشای یەکتریان کرد. نەیاندەزانی چی بکەن. لەناکاو ڕوخساری ئاشق عەلی کرایەوە، لەبەرامبەریان پیاوێکی دیت ،کە خەرمانەکەی بەبادەکرد:

-تەماشاکەن. واکابرایەك خەرمانەکەی بەبا دەکا.

ئەوانی دیکەش تەماشایان کردو خۆشحاڵ بوون. بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن ئاشق عەلی لەپێشداو ئەوانی دیکەش بەدوایدا بەرەو لای کابرا وەڕێکەوتن.

-ماندوونەبی کاکە.

کابرا خۆشحاڵ بوو.

-سەلام بەخێربێن. فەرموون. کوێرە چت دەوێ دووچاوی ساغ. دەزانن خەرمان بەبا کەن.؟

ئاشق عەلی گوتی:

-دەزانین. بۆ هەمووومان شەنەت هەیە.؟

-شەش شەنەی لێیە. قەراربوو کوڕەکان بێن بەلآم شەوی ڕابردوو لەئاوایی شەڕو هەرا دروست بوو. دوو کەس بریندار بوون.

-ئیشاڵلا خێردەبێ.

کابرا گوتی:

-ئەمن ناوم ڕەسووڵە.

ئەوانی دیکەش ناوی خۆیان پێگوت.

-فەرموون ئەودش شەنەکان، هەر کەسەو شەنەیەکی بەدڵی خۆی دەست داتێ.

حەمە چکۆل لە شوێنی خۆی ڕەق ڕامابوو.

هۆسۆك گوتی:

-ئەوە منداڵە، تا ئێستا فێری خەرمان بەباکردن نەبووە.

گەڕایەوە لای حەمە چکۆل:

-حەمەد ئەتۆ بڕۆ لەبن سێبەری ئەو داشقەیە دانیشە.

کوڕە بێ ئەوەی قسەیەك بکات چوو پاڵی وە تایەکانی داو لێی دانیشت.

کەمێك ئەولاتر، لەسەر چۆمی گیا وشترخۆرەی شین گوڵیان دەرکردربوو، بە ڕۆژبا دەلارانەوە.

کوڕەکان دەستیان کرد بە خەرمان بەباکردن و تا ئێوارەیەکی درەنگ جێخوونەکەیان سوورکرد. ڕەسووڵ هەر یەکەو پارەی خۆی دانێ وگوتی:

-زۆر سوپاس. خوا ئاگادارتان بێت براینە. نە جاتودام. ئەمن بە سێ ڕۆژانیش نەمدەتوانی لێوەبم و تا ئەوکاتیش تەپۆ کەوڵیان دەکردم. ئێستاش هەتا نانی نەخۆن نایەڵم بچنە هیچ کوێ.

ئاشق عەلی ویستی زیرەکی بکا گوتی:

-بەپەلەین دەبێ بڕۆین و ئەوێ بدۆزینەوە. هەرچۆنێك بێ دەبێ خۆمانی بگەیەنینێ.

-خۆتان بگەیەننەکوێ؟

-بە دارهەناری سەرگردەکە. تۆ دەزانی ئەو گردە لەکوێیە؟ دیارە لەچوکوراوا هەموو کەس پێیدەزانێ.. . ناونیشانەکەشیان بەئێمەگوتووە.. .

-ئێستا فەرموون وەرن دانیشن و نانەکەتان بخۆن. ئەوە هێندە کارێکی گران نییە. پێم وایە کەمێك لەولایە دارهەنارێکی لێبێت. ئێستا وەرن دانیشن. خێزانم خواردنی دە کەسانی لەخورجێنیدا پێچاوەتەوە. وەرن دانیشن و نانەکەتان بخۆن، هەر ئێستا مەلا حاجی لەو خوارەیرا پەیدادەبێ بەخۆی و بەگوڵێکی پشت گوێی. ئەو هەموو ڕۆژێ گوڵێکی لێدەکاتەوەو لەپشت گوێیەوە دەکات و تێدەپەڕێت. پاش نەختێکی دیکە بێرەدا تێدەپەڕێت. لە باخە پرتەقاڵەکەی ڕادێتەوە. دیارە هەر ناوی باخە پرتەقاڵە، دەنا لەحەڤدە ئەمام زیاتری تێدا نییە. باخە پرتەقاڵەکەی هەموو زستانان لافاو دەیبات و ئەویش هەموو بەهاران دووبارە حەڤدە ئەمامە پرتەقاڵی دیکەی لێدەچێنێ. پێموایە ئەو بزانێ دارهەنارەکە لەکوێیە. ئەوە هەرخوا دەیزانێ.

چاوەکانی دەبریسکانەوە درێژەی دایە:

-ئێستا ئێوە نانەکەتان بخۆن. بەڵکو ئەمنیش وەبیرم بێتەوە، کە دارهەنارەکە لەکوێیە. حەتمەن دەبێ ئەو دەورو بەرانە دارهەنارێکی لێ بێت.

ڕەسووڵ سفرەکەی ڕاخست لەنێو قابلەمەکەدا دوومریشك و نیوی سوورکراوەی تێدابوو، سینییەکی پڕیش پلاوبرنج کە ئێستاش هەڵمی لێهەڵدەستا. کرێکارەکان بۆ ئەوەی هەرچی زووتر خواردنەکەیان بخۆن ولێوەبن هێرشیانکردە سەرسفرەکە. بەخێراییەکی چاوەڕواننەکراو ئەوەی لەسەر سفرەکەبوو خواردیان و تەواویانکرد.

بە ڕاوێژێکی نووزانەوە دەپاڕانەوە:

-جێگای ئەو دارهەنارەمان پێبڵێ براله. پێویستی زۆرمان پێیەتی. هەر دەبێ وەیببینین.

-دوو مانگە لە چوکوراوا دەگەڕێین هیچ کارێکمان دەست نەکەوت. وسووش دەمرێ هەموومان نەخۆش دەبین و دەمرین.

کابرا هەوڵی دەدا وەبیرخۆی بێنێتەوە:

-ڕاوەستن. کەمێك ڕاوەستن. با هەندێك بیربکەمەوە. هەر ئێستا جێگای ئەو دارەتان بۆ دەبینمەوە، هەر ئێستا دێتەوە یادم. لێکدا لێکداش سەری بۆ لای جادە وەردەسووڕاند:

-ئەو مەلاحاجیە دەبێ بۆ دیارنەبێ؟

ئاشق عەلی بە پاڕانەوە دەیگوت:

-توخوا زووکە براله بیربکەوە، بەڵکو شەومان بەسەردانەیەو خۆمان بگەیەنینە ئەوێ و ئەو دارەپیرۆزەی ببینین.

-هەر ئێستا، هەر ئێستا.. . .

ڕەسووڵ دەیڕوانییە شاخە دوورەکانی ناناوارزاو چۆمی ساوروون، کە وەکو جۆگەلەیەکی باریك بەدەشتەکەدا دەڕۆیشت و تەماشای کێوەسوورو سەرسەوزەکەی دووڵ دوڵی دەکرد، کەلەپشت کێوەشینەکاندا نوقمی نووربوو و بەدوای هانایەکدا دەگەڕا. لەوبەینەدا سەرو کەڵلەی حاجی لەپشت کەندالّی چۆمی وەدەرکەوت.

ڕەسووڵ بەخۆشحالّی بەرەولای غاری داو گوتی:

-زۆرلەمێژە چاوەڕوانتین. سۆمایی چاوانمان داهات. نازانی چەند لەمێژە چاوەڕوانتین. !

بەبێ ئەوەی پشووی تازەبکاتەوە درێژەی دایە:

-ژنێکی خەڵکی ئەو دێیانەی خوارێ ناونیشانی ئێرەی پێگوتوون، کە ئەگەر لەسەر ئەو گردە سپییە و لەبن ئەو دارەی ڕۆژێکی بنوون، لە هەموو دەردو بەلایەك ڕزگارتان دەبێت. ئەو برادەرانە بەدوای ئەو دارهەنارەدا دەگەڕێن. سەیرکە لە چاوتروکانێکدا خەرمانەکەی منیان بەباکردو سووریان کرد، چ پیاوەتییەکیان لەگەڵ کردم. دەنا کوا ئەمن و تۆ

دەمانتوانی بە چەند ڕۆژانیش لێوەبین.؟ لەمن پێم گوتوون لەو دەوروبەرە گردێکی لێیە، بەلاّم نازانم لەسەر گردەکەی دارهەناری لێیە یان نا؟گوتم ئەوەیان حاجی دەیزانێ.

حاجی گوتی:

-ئەمن دەزانم. ئەو دارهەنارە یارمەتییەکی زۆری بە من و بە گوندەکەمان گەیاندووە. بەلاّم مخابن وشك بووە.

دەستی هەلێناو شیوی لاپالێکی ڕەنگ خۆلەمێشی نیشاندان:

-تەماشاکەن. دارهەنارەکە لەوێ بوو. لەسەرئەو گردەی کە سپی دەچێ. بەقەد چنارێك دەبوو. لەسەرەتای هاویندا گوڵی دەداو لەدوور ڕا وەکو بلێسەی ئاگر سوور دەچووەوە.. . هەرکەسێك لە پەناوێ و لە ژێرسێبەریدا یان لەسەر ئەو خاکەی شەوێکی لەوێ نووستبا، ئەوەی لەخوای داواکردبا بەنسیبی دەبوو. بروانە لەهۆوێ. زۆریش دوورنییە، ئەگەر پێتان خۆشە ئەوشەو لێرە لەکنەمە وەمێنن.. .

ڕەسووڵ گوتی:

-سبەینێ هەتا نیوەڕۆیە یاریمان بکەن. ئەمنیش پارەیەکی باشتان دەدەمێ. سبەینێ نیوەڕۆیە وەڕێکەون و بۆ ئێوارێ دەگەنێ. تەماشاکەن زۆریشی نەماوە خۆرئاوابێ. ئەگەر ئێستا بڕۆن شەوتان بەسەردادێ، ئەوکاتیش دارهەنارەکە هیچ، گردەکەش نابیننەوە.

ڕەسووڵ ڕاستی دەکرد. ئەوشەوە لەوێ مانەوە. تەپۆ هێرشیان هێنا، نە لە ئاور دەسلەمینەوە نە لە دووکەڵ.. .

بەیانی زوو چوونەسەرکار. لای نیوەڕۆیە گوتیان:

-ئێمە دەڕۆین خواحافیز کاکە گیان. پارەکەیان لە ڕەسووڵ وەرگرت.

مەلا حاجی بە دیقەتەوە جێگاکەی نیشاندان. ئەوانیش لە خۆشیان لە پێستی خۆیاندا نەدەگونجان.

زۆری لەنیوەڕۆ لادابوو کە گەیشتنە سەر ئەو گردەی کە حاجی نیشانی دابوون. لەسەرگردەکە نە لکەدارێکی سەوزو تەنانەت گەلاّیەکیشیان نەدیت. ڕاست لەسەر تەپۆلکەی گردەکە قەدی دارێکی شکاویان چاوپێکەوت، کە لە عەرزیدابوو ڕەگەکانی بەسەرتاپای گردەکەدا بلاّوببوونەوە.

ئاشق عەلی هاواری کرد:

-دیتمەوە. خودایە زۆر شوکر. ,دیتمانەوە. ئەوە خۆیەتی، ئەوە ڕەگی هەمان دارهەنارەکەیە.
هۆسۆك گوتی:
-ڕەگی خۆیەتی.
حەمەدیش وەقسەهات و گوتی:
-ئەگەر بۆ خۆشی نەماوە خۆ ڕەگەکانی ماون. ڕەگ بێ یان قەدی، یان گوڵە سوورەکانی، یان لك و گەلاکانی، هەر کامێکیان بێت فەرقی نییە.
وسوو گوتی:
-هەمووی هەر یەکە.
ئاشق عەلی گوتی:
-با دووعا بخوێنین.
دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو بەرەو قیبلە ڕاوەستا. ماوەیەك لەبن لێوانەوە دووعای خوێند، تەنیا حەمە چکۆل تێکەڵیان نەبوو.
ئاشق عەلی پرسی:
-ئەتۆ نازانی دووعا بخوێنی؟
حەمە چکۆل وڵامی دایەوە:
-بۆچی، دەشزانم.
-زۆر باشە.
-ئەو دارە مردووە، نەیتوانیوە خۆی بپارێزێ. بەرامبەر بە ئێمە چی پێدەکرێ.. . .
هۆسۆك ڕایکردێ و بەسەریدا شیڕاند:
-بێدەنگ بە، بێدەنگ بە. خەریکی لەدەستمانی دەدەی. بێدەنگ بە هەتیوە چڵمنە.. . لەبارەی ئەو دارە پیرۆزەوە قسان نەکەی.
ئەوانی دیکەش قسەکەی هۆسۆکیان سەلماند. لەوانەیە هەتا نیوەشەوێ دەربارەی ئەو دارەو مووجیزەکانی لەگەڵ حەمەدی قسەیان کرد، بەلام ئەو بەوگوێیەی داهات و بەگوێیەکەی دیکەیدا چووەدەرێ.

ڕۆژ با کە لەئێوارێوە هەڵی کردبوو، بەرە بەرە تووندتری کردو بووبە گەردەلوول. لەسەرگردەکە لەبەرتوندیی بایەکە شوێنەوارێك لەتەپۆیان نەمابوو. ئەوشەوە تابەیانی بەناسوودەیی لێی نووستن.

لەپێشدا ئاشق عەلی وەخەبەرهات. سازەکەی لەپشت سەری بوو، دەستێکی پێداهێنا لە تەواوی تەمەنی خۆیدا هەموو بەیانییەك کە وەخەبەر دەهات دەستێکی بەسەر سازەکەیدا دێنا. ئەوە بەختی بۆ دێنا.

پاشان حەمەد وەخەبەرهات. لەدوای ئەویش وسوو، دوای هەموان هۆسۆك وەخەبەرهات. لەگردەکە هاتنەخوارو بەرێز دەرۆیشتن. ماوەیەکی باش میزیان کرد. تازە زانیبوویان کە حەمە چکۆلیان لەگەڵدا نییە. تەماشایەکی یەکتریانکرد. حەمەد گوتی:

-حەتمەن هەر لەو دەوروبەرانەیە. ئەگەر لێیبگەڕێین دەیبینینەوە، کێ دەڵێ بۆ خۆشی ناگەڕێتەوە.

ئاشق عەلی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

-ناگەڕێتەوە. ئەو تازە هەرگیز ناگەڕێتەوە لای ئێمە.

وسوو گوتی:

-ڕۆیی و ڕۆیی. چ کوڕێکی باش بوو. هەموو خەون و خەیاڵی جووتەگایەکی شاخ کەوانی بوو.

لەناکاو هۆسۆك گوتی:

-خەنجەرەکەم کوا.. . ؟ کوا خەنجەرەکەم.؟ .. .

بەسەر گردەکەدا غاری دەدا. لەلایەك خۆی دەپشکنی و لەلایەکیش بە دەوروبەری خۆیدا دەڕوانی:

_خەنجەرەکەم.. . خەنجەرەکەم نەماوە! هەتیوە شەوێ دی خەنجەرەکەمی دەرهێناوەو تێیتەقاندووە. !

پاشان بێدەنگ بوو ئیدی قسەی نەکرد. لە نێوەڕاستی گردەکە ماوەیەك ڕاوەستان. سەرەنجام ئاشق عەلی بە ڕاوێژێکی وا کە دەتگوت تازە لە خەوێ هەستاوە گوتی:

-دیاربوو کە ئەو کارەی دەکرد. خوابکا بەڵایەکی بەسەرنەیەت. ناتوانی لەدەست چارەنووس هەڵێی.

ئەوانی دیکە هیچ قسەیەکیان نەکرد.

ئاشق عەلی لەپێشداو ئەوانی دیکەش بەدوایدا لە گردەکە هاتنەخوارێ. ڕوویان کردە ئەو کێوانەی مژێکی شینی تاریك دایپۆشیبوون و بەرەو( بەینبووغالار) ڕێیان گرتەبەر. لەلای ڕاستیانەوە لە دووریڕا چیای دوولّدوولّ بەرەبەرە ڕوون دەبوو. لای نیوەڕۆیە لە ( دیکنلی) تێپەڕین. کاتێك گەیشتنە دەوروبەری (قەرەتەپە) بۆنی کوێستان و بۆنی پنگ و سنەوبەریان بە بەر لوتیدا هات.

حەمەد لەپێش هەمووانەوە بە هەنگاوی درێژ دەڕۆیشت. ماوەیەك ڕاوەستاو پاش ئەوەی هەناسەیەکی قوولّی هەلکێشا گوتی:

-گا زەردیان کردمە قوربانی ئاشق عەلی. کاتێك ئەمن لێی جیابوومەوە دەگریا، ڕاست وەکو بنیادەمان.. .

ئاشق عەلی هیچ قسەیەکی نەکردو ڕێگایان گرتەوەبەر.

کۆتایی